# فروغ لە قەڵەمڕەوی شیعر و ژیاندا

نووسین و ئامادەکردن و پاچڤەی
حەمەکەریم عارف

ناوی کتێب: کەسێ کە وەك هیچ کەس نی یە
بابەت: ژیاننامە و ئەزمونی شیعر
وەرگێڕانی: حەمە کەریم عارف
دیزاین: فازیل کەوڵۆسی
چاپخانەی تاران
چاپی یەکەم ٢٠١٧
تیراژ:١٠٠٠ دانە
نرخ:٥٠٠٠دینار
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی( ١٤٥٢ )ی ساڵی ٢٠١٥ پێدراوە

## پێڕست

## یەکەم: دەستپێك

دنیای شیعری فارسی بێ فروغی فەروخزاد "١٩٣٤- ١٩٦٦" بۆنی ئافرەتی لێنایەت... فروغ ئازارمەندانە لەزەتی دەبردو هونەرمەندانە ئازاری دەچەشت، فروغ شیعری هەڵنەبژارد بوو، بەڵکو شیعر ئەوی هەڵبژارد بوو تا بە زمانی ئەوەوە رازی دڵی ژن بڵێ، چونکە تا ئەو دەمە کەمتر ژنیکی پەیدا کردبوو کە بە راستگۆیی و بوێری وشەهامەتو ڕاشکاوی ئەوەوە ببێ بە پەیامبەری پەیامی شیعرو بەو پەیامە تینوویەتی بەدەنی و رۆحی خۆی بشکێنێو شیعری لەلا ببێ بە مێژوو، بە مندالێو لە ئەنجامدا بە کامڵ بوونی مرۆڤانی... شیعر یەخەی ئەوی دەگرتو ئەو شەڕی بە شیعر نە فرۆشتووە... بەخۆی دەڵێ: " شیعری خراوم زۆر وتووە، سەردەمانێ کە شیعرم دەوت، شیعر بە شێوەیەکی خۆرسك و زگماك لەمندا هەڵدەقولا، رۆژی دوو-سێ شیعرم دەوت، لە ئاشخانە، بەدەم درومانەوە، ڕاستە دیوان لە دوی دیوانم دەخوێندەوە، پڕ دەبووم، بە هەرحاڵ بەخۆیشم سووکە بەهرەیەکم هەبوو، بۆیە ناچار دەبوایە ئەو حاڵەتە عەکس بکەمەوە، نازانم ئەوانە شیعر بوون یان نا، بەلاّم دڵنیام راستگۆیانە بوون، من هێشتا دروست نەبوو بووم، زمانو شێوەو دنیای فیکری خۆم نەدۆزی بووەوە..." بڕوانە ( برگزیده اشعار فروغ فرخزاد /چاپ جیبی).

زۆر ئافرەت هەیە کە بۆ شووکردن نەخوڵقاون. فروغیش یەکێك بوو لەو ئافرەتانە، لەگەڵ ئەو جیاوازییەدا کە چارەنووسی زۆربەی ئەو ئافرەتانە سەرگەردانییە لە دنیای ژمارەیەك شووکردندا، روو بە ڕووبوونەوەی ئەشقی نە بەکام و تاڵو شیرینی ئارەزووەکانی دڵە، تا سەرەنجام گاسنی رۆژگار روخساریان دەکێڵێو بەفری پیری سەریان دادەپۆشێو بەدەنی گەرم و گوڕیان وردە وردە لە ساردی مەرگ نزیك دەبێتەوە. بەلاّم فروغ پاش ئەوەی لە کۆتی ژن و مێردایەتی رەها بوو، چیدی ملی نەدایە "ئەسیر"ی بەڵکو "عصیان"ی کرد، یاخی بوو، بۆ هەمیشە رەها بوو وبە ڕەهایی ژیا، چونکە لە مێرد دابڕا، خۆی لە شیعر مارەکردو "لە دایك بووەوە"... فروغ ئاشقێکی گەورەی ژیان بوو، باوەڕی وا بوو دەبێ شیعرو ژیان بە جۆرێ ئاوێتەی یەکدی بن کە لە جیابوونەوە نەیەن. هەر لەم پێوادنگەوە دوژمنی سەر سەختو ژمارە یەکی ڕیا بوون، دەنگو رەنگی فروغ، ئەفسوونێ بوو کاری لە هەمووان دەکرد، لێ مەخابن زۆربەی ئەو کەسانە لە دەنگی تێنەدەگەیشتن... فروغ بە ئەسیری هاتە دنیاوە، سەری دا بە "دیوار"ی زینداناو "یاخی" بوو، لە هەوڵو تەقەلای "لە دایکبوونێکی تر"دا بوو بۆ خۆی و

هـەموو دنیـا... ئـەوەتا بـە خـۆی دەڵـێ: "یـاری مـن شـیعرەو شـیعرە دڵـدارم، دەڕۆم، دەڕۆم تـا بەدەستی دەهێنم".

فروغ ئینسانێك بوو ئاشق، لە ئەشقدا دەسووتاو لە ئەشقدا لە دایك دەبووەوە. شەوان بە دەم ماچێکەوە دەمردو سپێدە بە دەم ماچێکی ترەوە زیندوو دەبووەوە. ئەشق لەلای ئەم مرۆڤە یاخییە شۆڕشگێڕە هەم ئارام بەخش بوو هەم سووتان‌و هەڵچوون‌و دانەمرکانەوە، فریاڕەسێك بوو تا ژیانی لە بێزاری‌و نا ئومێدی و بێتاقەت بوون، پێ رزگار بکات‌و شکۆو مەزنایەتییەکی ئینسانی پێ ببەخشێت، فروغ ئینسانێك بوو زەحمەتە ئەوەی لەسەر ساغ بکرێتەوە کە ئەو لە شیعرو ئەشق بوو بوو، یان ئەشق و شیعر لەو بوو بوون، ئەو فرزەندی ئەمان بوو یان ئەمان فەرزەندی حەڵاڵزادەی بێ غەل‌و غەشی ئەو بوون، ناڵەی ئینسانییانەی ئەم مرۆڤە سەوداسەرە لە هەڕەتی هەڵچوون‌و هاڕوژاویدا، لە نەوای شیعرێ دەچوو، سۆفییەکی ئاشقە ئینسان لە شەوێکی خامۆش و کپدا بە سۆزو ئاوازەوە بیخوێنێ. بە خۆی لەمبارەیەوە دەڵێ: "لە لووتکەی ئەشقداو لە هەڕەتی تێکەڵ بوونی ئاشقاندایە کە مرۆڤ دەگاتە خوا ". فروغ هەموو شادی‌و خەمەکانی، خۆشی‌و ناخۆشییەکانی هەڵدەڕشتە ناو شیعرەوەو هەر شیعر بوو بەرگەی کوڵ‌و کۆڤانی ئەو مرۆڤە مەزنەی دەگرت. لە هەموو حاڵێکدا لە شیعرەوە دەستی پێدەکردو دیسان دەگەڕایەوە باوەشی شیعر .. شیعرە بۆ ئەو پەناگەیەکی ئاسمانی بوو... بەخۆی دەڵێ:

" شیعر بۆ من پێد اویستییە، لە خواردن‌و خەوتن پێویست ترە، شتێکە هاوتای هەناسە، من لە شیعر جیا نیم، شیعر بریتییە لە ژیانی وشە لە ناخی مرۆڤداو ئەوجا نووسینی ئەو وشانە بە شێوەیەکی زیندوو لەسەر کاغەز، بۆیە دەبێ خۆ لە هەموو لەنگی یان وەستانێك بپارێزێ کە دەبێتە مایەی بێ گیان کردنی وشە."

بەڵێ شیعر بۆ ئەو پەناگەیەکی ئاسمانی بوو... چونکە شاعیر بوون بەلای ئەوەوە هاوتای بە ئینسان بوون بوو، بەخۆی دەڵێ: " هەندێ کەس دەناسم کە رەفتاری رۆژانەیان چ پێوەندییەکی بە شیعریانەوە نییە"، واتە تەنیا ئەو دەمانە شاعیرن کە شیعر دەڵێن. پاشان لە شاعیری، واتا لە ئینسانییەت دەکەون‌و دەبنەوە بە مرۆڤە گورگ‌و زاڵم‌و کورتبین‌و بەغیلەکەی نێو گورگستانەکە. من بە قسەی ئەم جۆرە مرۆڤانە قاییل نیم. من پتر بایەخ بە ژیان دەدەم‌و کاتێك ئەم ئاغایانە دەکەونە سمکۆڵان‌و نەڕە نەڕە – واتا لە شیعرو نووسینەکانیاندا– دڵم تێك هەڵدێ‌و باوەڕ ناکەم راست بکەن... لە دڵی خۆدا دەڵێم ناشێت ئەم هەموو هەراو هەنگامەیەیان بۆ کاسە پلاوێك بێت!!..

شیعر بۆ ئەو پەناگەیەکی ئاسمانی بوو... دەنا وەك هەر ژنێکی هەوەسبازی نێرباز، تۆفانی غەزەبی کۆمەڵگە ڕایدەماڵی‌و نەدەبوو بەم ئەستێرە گەشەی ئاسمانی نەمران، هەر شیعر بوو ئەوی "ئەسیر" و "عاصی" کردو لە ئەنجامدا گەیاندییە "لە دایك بوونەوە"...

فروغ وەختێ دێتە سەر باسی شیعری خۆی، پتر بەلای "لە دایك بوونێکی تردا"دای دەکێشێ‌و وا هەست دەکرێ لە شیعرەکانی پێشووی پەشیمانە، یان جۆرە پەشیمانییەك لە قسەکانیدا بەدی دەکرێ... خۆشی بە ڕاشکاوی ئاماژە بۆ ئەم پەشیمانییە دەکات‌و دەڵێ بۆیە

ژێوانە چونکە بە شێوەیەکی سادەو ساکار دنیای دەرێی وێنەکێشاوەو دەربڕیوە، بەڵام پێناچێت ئەم پەشیمانییە سوودێکی هەبێ، چونکە شیعرەکانی لە کتێبدا بڵاوبوونەتەوەو شایەتی ئەو قۆناغانەن کە شیعری فروغ پێیاندا تێپەڕیوە... دیوارو عصیان لە قە فرتێیەکی نا ئومێدانەیە لە نێوان دوو قۆناغی ژیاندا، هەوڵو تەقەلایەك بوو بۆ جۆرە رزگارییەك، زەمینە خۆشکردن بوو بۆ گەیشتن بە قۆناغی بیرکردنەوە... هەست لە سەردەمی لاویدا رەگوڕیشەی سستی هەیە، تەنیا روالەتی ناسکیان هەیەو ئەگەر پاشان فکرێك نەبێ بە جڵەوکێشی یان لە ئەنجامی بیرێکەوە گەشە نەکات ئەوا وشك دەکاتو دەمرێ... فروغ لە دیوانی دیواردا بە شیعری "گنە کردم گناهی پر ز لذت" بەوپەڕی تواناوە هەڵچوونی بەدەنی نیشان داوەو دەشێت بڵێین، بەم شیعرە دەیەوێ خیتابی "ژنایەتی" مۆر بکاتو بە ئاستەمێ بە دیوی ژنانەی ناوەوەی ژندا شۆڕببێتەوە، پاش هەردوو دیوانی "ئەسیر"و "دیوار" دیوانی "عصیان" دێتە پێشێو دەشێت بە پێشەکییەکی دابنێین بۆ هەنگاوێکی کۆكو پتەوتر... بەڵام فروغ لە "لە دایك بوونێکی تر"دا پتر بە ناخی خۆیدا رۆدەچێتو شیعرەکانی بە شێوەیەکی ئەستوونی دەڕۆنو دەست بەرداری رەوتی ئاسۆیی بووە، هەڵبەتە لە شیعردا تا پتر دنیای ناوەوە بێ پەردەو شاعیرانە بخرێتە روو، ئەوەندە پتر شیعرییەت بە هۆنراوەکە دەدات .

فروغ، ئەشقێکی دەویست لە هەواو هەوەسی کاتیو ساتەوەختی بیپارێزێو بەلای ئەوەوە ئەو جۆرە ئەشقە زامنی پاکی ژن بوو. لەلایەکی تریشەوە هەواو هەوەسی ساتەوەختیشی، بە تایبەتی لە هەڕەتی هەڵچوونو هاڕووژاندا، لە ئەشق بە کەمتر نەدەزانی"

من پەرییەکی چکۆلەی غەمگین،

دەناسم، کە ئۆقیانووس نشینە

دڵی لە بلوێرێکی قامیشدا

هێدی هێدی لێدەدا

پەرییەکی چکۆلەی غەمگین کە شەوانە بەدەم ماچێکەوە دەمرێو

سپێدە بەدەم ماچێکەوە

لە دایك دەبێتەوە.

فروغ، تەقینەوەی گرێکوێرەی بە سوێو لە کرانەوە نەهاتووی بێدەنگی ژنانی ئێران بوو، شیعری فارسی بەبێ فروغ بۆنی ژنی لێنایەتو تازییەبارو بێگیان دێتە بەرچاو... فروغ شانازی بە ژنایەتی خۆیەوە دەکرد. ژن بوو، بەڵام خۆی لە پیاو جیا نەدەکردەوە، فروغ لەو ژنانە نەبوو بچێتە سەر مینبەرو کۆڕ بگێڕێ، بەڵام لە تەنیایی خۆیداو بە تەنیا زۆرترین کاری بۆ ژنانی ئێرانی ئەنجام دا... فروغ بە حوکمی ئەو شوێنە تایبەتییەی کە گرتبووی، لەگەڵ چ کەسێکدا بەراورد ناکرێ، تەنیا فروغەو بەس، بە تاقی تەنیاو تاقە سوارە زمان حاڵی هەموو ژنانی بێدەنگی چەندین سەدەی ئێران بوو. بە تەنیا لە مێژووی نێر ونێرسالاری یاخی بوو، بوێرانە خۆی کرد بە یەکەم ئاڵا هەڵگری مێ.... فروغ تاقە قارەمانی تراژیدیایەکی سخوچڕو مسیبەت ئامێزە.

ژنانی ئێرانی ئەگەر لە باری داهێنانی شاعیرانەوە چەندین سەدەیە، نەزۆك بن ئەوا لە (فروغ)دا ئاوس بوونەوەو بەوپەڕی روونیەوە لە ئاوێنەی زەماندا رەنگیانداوەتەوەو فروغ بۆشاییەکی بێوێنەی بێ هاوتای پڕکردەوە. شیعر قەدەرو چارەنووسی فروغ بوو... شیعرو فروغ لێکدی جودا نەدەبوونەوە، واتا لە یەکدیدا فەنا بوو بوون، بەخۆیشی نەیدەزانی ئەو شیعرە یان شیعر ئەوە "شیعر ئەو بەشەیە کە تەواوم دەکات".

ئەگەر بتوانین بڵێین شیعر بازنەیەکی بۆشەو شاعیر بە خۆی پڕی دەکاتەوە ئەوا فروغ بە جۆرێ بە خۆی پڕی کردۆتەوەو ئاوێتەی بووە پیاو نازانێ ئەو شیعرە یان شیعر ئەوە. هەندێجار وا هەست دەکەی شاعیر نەماوەو بە راستی لە شیعردا فەنا بووەو ئەگەر فروغ بیوتبا (أنا الشعر) چ زێدەڕۆییەك لەو قسەیەدا بەدی نەدەکرا. چونکە ئەو ئافرەتە هەرگیز خەمی چوونە پێشی نەبوو، بەڵکو خەمی گەورەی ئەو رۆچوون و قووڵبوونەوە بووەو رەنگە هەموو داهێنانێکی رەسەن بەو جۆرە سەری هەڵدابێ. ناوەڕۆکی شیعرەکانی هەمان سیانەی نەمری سەرمەدییە کە پێی دەوترێ سێکوچکەی "ئەشق، جوانی و مەرگ" ئەم ناوەڕۆکانە هەر لە سەردەمی دەسەڵاتی ژنسالارییەوە تا ئەمڕۆ ئەگەرچی بە پێی شوێن و زەمان شێوەی جیاوازیان گرتۆتە خۆ، بەڵام لە باری مەعناو چەمکەوە وەك خۆیان ماون... فروغ دەڵێ: "پێموایە ئەوانەی لە بواری هونەردا کاردەکەن، یەکێك لە هۆیەکانی بریتییە لە پێداویستییەکی ناخود ئاگایانە بۆ روو بە ڕوو بوونەوەی زەوالێ کە ئەمانە خەڵکانێکن کە ژیانیان پتر خۆشدەوێ و تێی دەگەن، وەك چۆن لە مەرگ تێدەگەن...
کاری هونەری هەوڵ و تەقەلایەکە لە پێناوی مان و نەمریدا، نەمری بەخشین بە خۆو سڕینەوەی مەعنای مەرگ....

"ئەشق، جوانی و مەرگ" وەك پەپوولە بە دەوری گوڵی ژندا سووڕاونەتەوە، جوانی سیفەتی ژنە، ئەشق هەوێنی ژنە، مەرگی خۆی یان دڵدارەکەی چارەنووسییەتی. جا فروغ لەبەر ئاوێنەی ئەم سێ ناوەڕۆکە نەمرەی شیعردا، جل و بەرگی زەمانی خۆی پۆشیوەو هێندەی بۆی کرابێ پێیاندا رۆچووەو بەرەو قووڵبوونەوە چووە... بۆیە هەر لەم پێودانگەوە شیعر لە لای ئەم ژنە هاوتای بوونە... پێیوایە هیچ پێوەندییەکی مرۆڤایەتی ناتوانێت مرۆڤ بگەیەنێتە لووتکەی کامڵ بوون، واتا کەس نابێت بە تەواوکەری کەس، ئەگەر وا بوایە ئەم پێوەندییە خۆی لە خۆیدا دەیکردە مەزنترین شیعری دنیا. " شیعر بۆ من پەنجەرەیەکە هەر وەختێ بەرەو روویدەچم خۆ بە خۆ دەکرێتەوە، لەبەریا دادەنیشم، تەمەشا دەکەم، گۆرانی دەڵێم، هاوار دەکەم، دەگریم، شیعر هۆیەکە بۆ بەرقەرار کردنی پێوەندییەکان لەگەڵ بووندا، چاکییەکەی لەوەدایە وەختێ کە مرۆڤ شیعر دەڵێ، دەتوانێت بڵێ: من هەم، یا هەبووم".

فروغ، ژنێك بوو کە لە کەوشەنی خەڵکی زەمانی خۆی جیا بووەوە، جیابوونەوە بەو مەعنایە نا، کە پلەیەك کەوتە سەرووی ئینسانەوە، بەڵکو بەم مەعنایە کە ئەو ئیدی بە پێوەری خەڵکی سەردەمی خۆی نەدەهاتە هەڵسەنگاندن، ئەو شتانەی کە ئەو دەیبینی و ئەو هەستەی سەراپای بوونی فەتح کردبوو، شتێك بوو جیا لە ئەقڵیەتی خەڵك... واتا فروغ بۆ خۆی فروغ بوو، تیشکێك بوو بە ڕاستی بە شکۆترین تیشك و ڕۆشنایی زەمانی خۆی بوو، لە کوچەو بازاڕدا لەگەڵ

خەڵكیدا دەژیا، دەیویست وەك ئەوان بێ... بەڵكو خودی ئەوان بێ... بەڵام جیا بوو، خەڵكی كوچەو بازاڕ لە زمانی تێنەدەگەیشتن، لە سەرەتادا زۆر بە ئاسانی رەفزیان كرد، كارەكانیان بە پێوەری تایبەتی خۆیان هەڵدەسەنگاند، پاشان كەوتنە ستایشی! ئیدی عادەتی خەڵكی عەوام ئەوەیە كە یەكێكی جیا لە خۆیان بینی یا ڕەفزی دەكەن یا ستایشی دەكەن، بەڵام كەسێك كە لەوان جیا بێ، شێوەو رەفزو ستایشی جیاو تایبەتی خۆی دەبێ، نە گوێ بە رەفزی ئەوان دەدات، نە باوەڕ بە ستایشیان دەكات. ئەوەتا فروغ دەڵێ: "من لەو كەسانە نیم كە دیتم بەرد سەری یەكێكی شكاندووە، ئیدی لەمەوە بگەمە ئەو ئەنجامەی كە نابێ خۆ لە قەرەی بەرد بدەم، من تا سەری خۆم نەشكێنێ لە مەعنای بەرد تێناگەم"، بەڵام مەرگ بە یەكجارەكی ئەوی لە زەمانی خۆی جیا كردەوەو فڕێی دایە ناو جەرگەی زەمانە لە بڕانەوە نەهاتووەكەوەو رەنگە زەمانێ بێ پێوەرێك لەگەڵ خۆیدا بێنێ‌و بتوانێت فروغ هەڵسەنگێنێ، مەسعوودی فەرزاد دەڵێ: "فروغ، بە باوەڕی من، شتێك بوو نزیكی حافز..." فروغ بە خۆی خۆزیای بە حافز خواستووەو لە نامەیەكیدا بۆ ئیبراهیمی گوڵستان دەڵێ: "... خۆزگە دەمتوانی وەكو حافز شیعر بڵێم، هەستێكی وەك ئەوم هەبایە كە پێوەندیی لەگەڵ هەموو ساتە راستگۆكانی تێكڕای ژیانی سەر لەبەری خەڵكی ئایندەدا دروست بكردایە". ئەوەتا شاملۆی شاعیریش لە دەرگای ئەو زەمانەی داوەو دەڵێ: "من هەرگیز نەمدیوە فروغ شتێك بدۆزێتەوەو ئەو شتە قەناعەتی پێبكات. فروغ لە شیعردا بە دووی چیدا دەگەڕا؟ ئەمە بەلای منەوە دەكاتە مەزنایەتی‌و گەورەیی بایەخی كاری شیعری لەلای فروغ"... رەزای بەراهەنیش لە دەرگای ئەو زەمانەی داوەو لە كتێبی كیمیاو خاك دا ل٨٤ دەڵێ: " گەورەیی فروغ لەوەدایە، بە تایبەتی لە ئاخرو ئۆخری تەمەنیدا پشت دەكاتە شیعری نیمایی‌و تەنانەت شاملوویی‌و دەگاتە ئەو قەناعەتەی كە ئاهو ناڵەی ژنانی هاوچەرخ نە بە كێشی نێرینەی نیمایی‌و نە بە پەخشانی ئاهەنگداری نێرینەی شاملوو نایەتە دەربڕین‌و نیشاندان. ژنێك نە وەك نیما دەنووسێت‌و نە وەك شاملوو.

فۆرمی شیعری فروغ، قەیرانی زاڵ بەسەر پێوەندییەكانی ژن‌و پیاو لە كۆمەڵگەدا، لە شێوەی قەیرانی شەكڵیدا دەردەبڕێ.

شیعری فروغ بەرجەستەكردنی ئاستەنگ‌و تەنگژەی شێوەی بیركردنەوەی ژنێكە كە شیعر دەڵێت. شیعری ئەو لە هەوڵی ئەوەدایە كە سەربەخۆیی خۆی وەربگرێ‌و لە دەسەڵاتی باوی شەكڵی شیعری پیاوان دەرباز بێ".

دنیای هونەرو ئەدەبیات، دنیای گۆڕینەوەی بیرو ئەزموونەو هیچ شاعیرێك نییە بتوانێ سوود لە ئەزموونی خەڵكانی دی وەرنەگرێت... دەشێت بڵێیت فروغیش گۆمێكی ژنانەی مەنگ بووە، شاعیرانی دی كەم‌و زۆر ئەو بەردە بوون كە مەنگییەكەیان شڵەقاندووەو شەپۆلیان پێبەخشیوە، لەوانە:

ئیبراهیم گلستان، حەكیم ناسر خسرو قبادیانی، محەمەد عەلی ئیسلامی، تاج بخش، ابو الحسن ورزی، فریدون توللی، شاملوو، نیما... فروغ لە بارەی نیماوە دەڵێ: "نیما رێنوێنی من بووە، بەڵام من خۆم خۆم پەروەردە كردووەو هەمیشە پشتم بە ئەزموونەكانی خۆم بەستووە..."

هەڵبەتە ئەم قسەیەی خاتوو فروغ راستە، چونکە فروغ پاش خوێندنەوەی نیماش شیعری خراپی زۆر وتووە... هەر لە شوێنێکی دیدا "جاودانە فروغ، أمیر اسماعیلو ابو القاسم صدارت" فروغ دەربارەی نیما دەڵێت: "نیما بۆ من سەرەتایەك بوو. نیما شاعیرێك بوو کە من بۆ یەکەمجار لە شیعری ئەودا فەزایەکی فیکریم بینی. هەستم کرد مامەڵە لەگەڵ ئینسانێکدا دەکەم، نەك لەگەڵ کۆمەڵێك هەستی سەرقە سەرقەو ئامانجی سواوی رۆژانە. سادەیی نیما سەرسامی دەکردم، بە تایبەتی ئەو دەمانەی کە لە پشت پەردەی ئەو سادەییە ناگەهانییەوە روو بە ڕووی ئاڵۆزیو پرسیارە تاریکەکانی ژیان دەبوومەوە، وەك ئەستێرەیەك کە سەرنجی مرۆڤ بۆ ئاسمان رادەکێشێت، لە سادەیی ئەودا، سادەیی خۆمم دۆزییەوە".

فروغ لە گەورەییدا منداڵو لە منداڵیدا گەورە بووە، جا با پێکەوە گوێ لەم دەمەتەقێیەی سەردەمی منداڵی فروغ لەگەڵ پورانی خوشکیدا بگرین:

- فروغ، حەزدەکەی دەستت هێندە درێژ بێ کە بگاتە ئاسمان؟
- بەڵێ، چونکە ئەو کاتە بە ئاوات دەگەم، دەتوانم ئەستێرەکان چەپك بچنم.
- دەتەوێ چی لە ئەستێرەکان بکەیت؟
- هیچ رەنگە ملوانکەیەکیان لێدروست بکەمو لە ملی بکەم. خۆ لەوەشە هەڵیانپروێنم تا بزانم چییان تێدایە.
- پوران، حەز دەکەم بزانم لە سەرووی ئەستێرانەوە چی هەیە؟
- من دەزانم، مامۆستاکەمان دەڵێ تەنیا هەوای لێیە.
- مامۆستاکەتان بۆ خۆی دەڵێ، بێگومان لە سەرووی ئەو ئەستێرانەوە شتێك هەیە، بەڵام نازانم چییە؟

تۆزێ لە فکران راچووومو وتم:

- دایە گەورە دەڵێ ماڵی خوای لێیە.
- حەز دەکەم بگەمە ئەوێو ماڵی خوا بدینم.

تۆزێ بێدەنگ بوو، و ئەوجا هەڵیدایێ:

- لەوەیە رۆژێ بێت بگەمە ئەوێو خوا بدینم.

بەڵێ ئەو فروغە ئاشقەی کە دەیوت: هەست دەکەم دڵم بە ئەندازەی هەموو دنیا گەورەیە، هەموو دنیاو هەموو دیمەنەکانی ژیانم خۆشدەوێ وەك ئەستێرەیەکی پرشنگدار لە تەمەنی سیو دوو ساڵیدا راخوشیو تاریکی باڵی بەسەر دنیای یاخیبوونی ئافرەتی ئێراندا کێشاو دنیای شیعری فروغانە بێ ناز کەوت.

ئەم ئافرەتە سەربەستە هەر لە منداڵی را زیرەکی پێوە دیاربووە، ئەوەتا خانمی یەزدی کە یەکێك بووە لە هاوپۆلەکانی دەڵێ: زەنگی وانەی ئینشا بەلای فروغەوە لە هی هەموو وانەکانی دی ناخۆشتر بوو. لێی نەدەڕۆیی، چونکە مامۆستای ئینشا هەمیشە سەرزەنشتی دەکردو دەیوت: " فروغ تۆ ئەمانە لە کتێبانەوە دەدزی". ئەم ئافرەتە لە بواری نیگارکێشیشدا دەستی

باڵای هەبووەو خەیاتێکی چاکیش بووەو، زۆر بە منداڵیو لە تەمەنی شازدە ساڵیدا شووی کردووەو زۆر زوو لە مێردەکەی جیا بووەتەوە.

ماڵو مێردی بەلاوە قەفەسو زیندان بووەو ئەویش تەحەمولی قەفەزو زیندانی نەکردووە. کوڕێکی بەناوی (کامیار) بووەو ئەم دایكو کوڕە لە دیداری یەکدی مەحرووم کراون، سادقی چوبەکی چیرۆکنووس دەڵێ: "فروغ هەمیشە خەمی دووری تاقە کوڕەکەی، کامیاری بووە، فروغیان لەلای ئەو منداڵە کرد بوو بە دێوو درنج، بە رادەیەك ئەو منداڵەش خۆی لە دیتنی دایکی دەدزییەوە. سبەینێ ئەگەر ئەو منداڵە گەورە ببێ. چی بە دوژمنانی دایکی دەڵێ؟ چی بەوانە دەڵێ کە فریشتەیان لێکردبوو بەخێو؟". دیارە فروغ زۆر نیگەرانی کوڕەکەی بووە، بە تایبەتی لەو رووەوە نیگەرانی بووە کە ئاخۆ چ راو بۆچوونێکی دەربارەی دایکی لە لا دروست کراوە. بۆیە هەمیشە دەیوت: "رۆژێ کامی گەورە دەبێو من وەك هەم دەناسێت. نەك بەو شێوەیەی فێرکراوەو پاکی ئەو منداڵەیان پێ لەوتاندووە". فروغ لە تەمەنی سیازدە چواردە ساڵییەوە دەستی بە شیعر وتن کردووە. لە تەمەنی (١٧) ساڵیدا یەکەم کۆمەڵە شیعری خۆی بە ناوی "ئەسیر"ەوە بڵاوکردەوە. ئەم کتێبە دوای سێ ساڵ چاپی دووەمی بڵاوکرایەوە. لە تەمەنی (٢١) ساڵیدا دووەم کۆمەڵە شیعری بە نێوی "دیوار"ەوە بڵاوکردەوە. دیارە ئەم دوو کۆمەڵە شیعرە گروپێکی تەنگبینی لێ هاڕوژاندو کەوتنە جنێو پێدانیو فروغی تاقو تەنیایان کرد بە ئامێرێك تاخۆیان شۆرەتی پێ پەیدابکەن. تەنانەت رەخنەگرێکی وەك "عبدالعلی دستغیب"یش دەڵێت: "لە هەردوو دیوانی "ئەسیر"و "دیوار"دا یاخی بوونی فروغ یاخیبوونێکی فەردییە، لە دەرێی زەمینە کۆمەڵایەتییەکاندایەو لە چوارچێوەی مەسەلە سێکسییەکاندا دەسوڕێتەوە". بەڵام فروغی بیست و یەك ساڵە زۆر لەوە یاخیترو بوێرتر بوو پەلاماری ئەو بابەتە کەسانە، سادری بکاتەوەو دەستبەرداری پەیامی شیعر بێ " شیعر ئەو بەشەیە کە تەواوم دەکات". لە تەمەنی بیست و دوو ساڵیدا وەك تەحەددا سێیەم کۆمەڵە شیعری خۆی بە ناوی "عصیان"ەوە بڵاو کردەوە، بەمەش خۆی خستە سەر رێگایەك کە ئیدی دەرفەتی گەڕانەوەو ژێوان بوونەوەی لە خۆ بڕیو دەبوایە بێباکانە بۆ پێشەوە هەنگاو بنێ. چونکە هونەر بوو بە قەدەرو چارەنووسی، ئەوەتا دەڵێ: "جا من هەقم چییە، با بە کەنار ئەم شیعرەدا "ای مرز پرگهر" تێپەڕنو کەپوویان بگرن. ئەم شیعرە زمانو شێوەی خۆی هەیە، من ناتوانم وەختێ کە باسی کۆڵانێکی پڕ لە بۆنی میزو پیسایی بکەم، لیستی عەتران لە بەردەم خۆم دابنێمو بۆن خۆشترینیان بۆ وەسف کردن هەڵبژێرم، ئەمە فێڵبازییە، فێڵێکە کە لە خۆ دەکرێ پاشان لە خەڵکی دەکرێ". دیارە ئەمە تەبیعەتی هەموو مرۆڤێکی یاخییە.

فروغ لە تەمەنی بیست و سێ ساڵیدا خووی دایە سینەماو لەو بوارەشدا هەمان فروغی یاخیو سەرسەختو بوێری دنیای شیعر بوو، بەڵام ئەو ژنە هەرگیز لە خۆی ڕازی نەبوو، هێندەی لە بێدەنگیو لە جێی خۆدا ئەم پێو ئەو پێ کردن بێزار بوو لە چ شتێکی تر وەڕەز نەبوو، بۆیە هەرگیز بە بێدەنگیو بێکاری دانەنیشتووەو، ئەوجاش کەم کەس هێندەی ئەو بەرانبەر بەخۆی بێ رەحم بووە، ئەوەتا لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێت: "من تەمەنم سی ساڵەو سی

ساڵ بۆ ئافرەت کامڵ بوونە، بەڵام ناوەڕۆکی شیعرەکانم سی ساڵان نابێ، گەنجترە، ئەمە گەورەترین خەوشی کتێبەکەی منە. دەبێ هوشیارانە بژیت. خوێندنەوەی من پەراگەندە بووە، ژیانم پارچە پارچە بووە، ئاکامی ئەوەیە کە درەنگ فامم کردۆتەوەو هۆشمو وەبەر هاتووە".

فروغ توانایەکی گەورەی فێربوونی زمانیشی هەبووە، لە سەفەرێکی چەند مانگیدا بۆ ئیتاڵیاو ئەڵمانیا ئەو دوو زمانە فێر بووەو بە چاکی قسەی پێکردوون. زمانی فەرەنسیشی بە ئەندازەی پێویستی خۆی دەزانێ، بەڵام زمانی ئینگلیزی چ وەك قسەکردنو چ وەك نووسینو تەرجەمە پێکردن بە چاکی زانیوە.

فروغ وەك یەکێك لە دۆستەکانی دەڵێت: "شادترینو غەمگین ترین ئینسان بوو کە دیومە، ئەگەر شادی بەرێیەکدا بڕواتو خەم بەرێیەکی دیداو ئەم دووە لە خاڵێکدا یەك بگرنەوە، ئەوا ئەم خاڵی یەکانگیرییە فروغە. فروغ خاڵی یەکانگیری غەمو شادی بوو".

ژیانی فروغ بە شیعرەوە بەند بوو، هەر کەسێك شیعری وتبا، خۆ بەخۆ دەبوو بە دۆستی، هەموو شیعرێکی بڵاوکراوەی دەخوێندەوە. پتر بایەخی بە شاعیرانی لاو دەدا، بیدیتبایە شاعیرێکی ناوداری سەردەمی خۆی شیعرێکی لاوازی وتووە، هێندە خەمبار دەبوو وەك ئەوەی خۆی گوناهێکی کردبێ، فروغ جگە لە بەرهەمە چاپکراوەکانی چەندین شیعر، دوو سیناریۆ، ڕۆمانێکی تەواو نەکراوو ژمارەیەك تابلۆو سکێچو نیگاری لە پاش بە جێماوە.. فروغ، یەکێك بوو لەو مرۆڤانەی بەفرو دیمەنی بارینی بەفری خۆشدەویست، ئیدی بە ڕێکەوتو لە ڕۆژی مردنە ناوەختەکەیداو لەو دەمەدا کە بە خاك دەسپێردرا بەفر ئەرزو ئاسمانی گرتبوو.. دایکی بەدەم فرمێسك هەڵڕشتنەوە چاوێکی گێڕاو بە دەم هۆڕژنی گریانەوە، هاواری کرد: " فروغ گیان.. تۆ بەفرت خۆش دەویست.. هەستە بڕوانە، چاوت بکەوە.. ئەم بەفرە لەبەر خاتری تۆ دەبارێ...."،.. "باوەڕبێنین بە سەرەتای وەرزی سارد" ناو نیشانی دوا دیوانییەتی کە لە پاش مەرگی چاپو بڵاو کراوەتەوە..

## دووەم:فروغ لە قەڵەمڕەوی شیعرو ژیاندا

گەورە بوو

خەڵکی رۆژگاری ئەمڕۆ بوو

سەر بە هەموو ئاسۆکراوەکان بوو

چەند باش لە زمانی ئاوو زەمین

تێدەگەیی.*

(بروانە: سهراب سپهری، هشت کتاب، حجم سبز، شعر "دوست" کە لاوانەوەیەکە بۆ مەرگی فروغ)

هەر چەندە فروغ بە خۆی گوتوویەتی: "قسەکردن لەمبارەیەوە (ژیانی شەخسی) بە بۆچوونی من کارێکی زۆر تاقەتبەرو بێفایدەیە، بەڵام ئەم حەقیقەتە هەیە کە هەر بەشەرێك دێتە دنیاوە، هەڵبەتە بەروارێکی لە دایکبوونی هەیە، خەڵکی شارێك یان دێیەکە، لە مەکتەبێکدا دەرسی خوێندووە، کۆمەڵێك واریقاتی زۆر ئاسایی‌و رۆتینی لە ژیانیا وەکو هەر کەسێکی دی روو دەدات، وەکو ئەوەی بە منداڵی بکەوێتە گۆلاوێکەوە. یا بۆ نموونە لە قوتابخانەدا قۆپی بکات، لە تەمەنی هەرزەکاریدا ئاشق ببێت، زەماوەند بکات‌و ئەو جۆرە شتانە.*" (بڕوانە: حرفهایی با فروغ فروخزاد: تهران، انتشارات مروارید، ١٣٥٦ ص١٢). بەڵام زانینی هەورازو نشێوی ژیانی هەر شاعیرێك، کارێکی پێویستە، بە تایبەتی شاعیری ئەمڕۆ کە جێ پێی ساتەکانی ژیانی شەخسی خۆی لە شیعرەکانیا کەم نییە، بەڵکو یەجگار زۆریشە. شاعیری ئەمڕۆ، گێڕەرەوەو ڤەبێژی ڕاستگۆی ساتەکانی ژیانی خۆی‌و ئەو کۆمەڵگەیەشە کە تیایدا دەژی. ئەرێنییەکان، نەرێنییەکان، خراپییەکان، باشیەکان، کرێتی‌و جوانیەکان وەکو نیگارکێشێکی زەبەردەست لە شیعرەکانی خۆیدا دەکێشێت‌و بۆیە شیعری ئەمڕۆ بە پێچەوانەوەی شیعری دوێنێمانەوە ئاوێنەیەکی روحیاتی شاعیرو مرۆڤانی سەردەمەکەی ئەوە، لەبەر ئەمە ناسینی سات بە ساتی ژیانی شاعیری ئەمڕۆ – بەتایبەتی شاعیرێکی وەکو فروغ کە لە هەموو ساتەکانی ژیانیا هەر شاعیر بوو– یەجگار پێویست دیارە.

فروغی فەڕوخزاد لە ١٥/دی ماە/١٣١٣ لە تاران دا چاوی بە دنیا هەڵهێناوە کە دنیای ئەو نەبوو، دنیای خەڵکانێك بوو کە چارەنووسی ئەوو هاورۆژگارانی ئەویان دیاری دەکرد. سەردەمی منداڵیەتی وی لە ماڵباتێکدا گوزەرا کە بە هۆی کاری سوپایی باوکیانەوە، جۆرە زەبت‌و رەبت‌و زەبرو زاکونی و دەسەڵاتداریەکی ڕەها باڵی بەسەردا کێشا بوو: "سیماو چارەی بابە ، هەمیشە پڕ بوو لە جۆرە زبری‌و زەبت‌و رەبتێکی سەیری پیاوسالاری. پیاوێك بوو تاڵی تاڵ، ساردی ساردو، زبری زبر. سەربازێکی راستەقینە بوو بە سیمایەکی رۆتینی یان بە گوتەیەکی دی بە دەمامك‌و ماسکێکی ترسناك‌و، هەمیشەش وا بوو. بیرم دێت هەرکە دەنگی

مامزەو ناڵچەی چەکمەکانی بەرز دەبووەوە، هەموومان دەپەشۆکاین‌و خۆمان لێی دەشاردەوە. بەڵام هەر ئەم بابە تووڕەو تڕۆیە. ئەم بابە زبرە کە ئێمە تەنانەت لە دەنگی پێیەکانی هەڵدەهاتین، جار جارێ کە وەخۆ دەهاتەوەو دەمامکەکەی لادەبرد، بەوپەڕی سۆزو گوداز‌و هەست‌و سۆزەوە لە هەمێزی دەگرتین‌و جوانترین روندکان لە گۆشەی چاوانیەوە دەڕژا. بابۆ ئاشق‌و شەیدای شیعر بوو. بابە جگە لە خوێندنەوە هیچ سەرگەرمیەکی دیکەی نەبوو و نیە. بابە هەموو تەمەنی خۆی لە دووی کەشف‌و تەحقیق بوو. سەرانسەری ماڵەکەی کردبوو بە کتێب‌و ئێستاش ژمارەیەك لەو کتێبانە بە بێنازی‌و بێ نەزمی لە ژووره تۆزاویەکەیدا کەڵەکە بووە."* (بڕوانە: سخنان پوران فروخزاد در مصاحبه با روزنامه کیهان، ٢١/ بهمن/ ١٣٥٠).

دایکی فروغ، ژنێکی دڵساف‌و ساویلکە بوو، لە باری زەمانیەوە لە رابردوودا دەژیا، رابردووی سەرڕێژ لە چاکی، جوانی‌و داب‌و نەریتانی پیرۆز: "دایکە، ژن بوو بە تەواوی مانای ژن. ژنێکی دڵساف، ساویلکە، منداڵاساو خۆشباوەڕ، ژنێ کە توانای ناسینی خراپییانی نەبوو و هەموو دنیاو خەڵك‌و خوای لە قاڵب و چوارچێوەی چاك‌و چاکیدا دەبینی، ژنێك پابەند بە هەموو داب‌و نەریتەکانەوە"* (بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو.)

فروغ چەند برایەکی هەبوو بە ناوێن: ئەمیر مەسعوود، میهرداد، مهران‌و فەرەیدوون. دوو خوشکیشی هەبوو بە ناوی پوران‌و گلوریا. فروغ چوارەمین منداڵی ئەم ماڵباتە بوو.

منداڵیەتی فروغ لە دنیای چیرۆکاندا بوری: "لە منداڵیدا عاشق‌و شەیدای چیرۆك‌و حیکایەت بوو. باپیرەیان چیرۆك‌و حیکایەتی جوانی دەزانی‌و فروغ بۆ تاقە ساتێکیش دەرفەتی بابە گەورەی نەدەدا. کە گوێی لە چیرۆکەکانی دەبوو، دووچاری جۆرە ماخولیایەك دەبوو."* (بڕوانە: پوران فروخزاد، هەفتەنامەی بامشاد، ابان ١٣٤٧= ١٩٦٨).

روناکی و بۆکەڵە، شنەو باڵندەو روناکی‌و ئاو، بە جۆرێ سات بە ساتی منداڵیەتی ئەویان تەژی دەکرد کە پاشان لە نێو جلەکانیاو لە توێی دەفتەرەکانی کاتی منداڵیەتیدا بۆ زەمانی لە دەستچووی منداڵیەتی خۆی دەگەڕا: "بۆ من هێشتاش، کە سەردەمی منداڵیەتی‌و تەنانەت جەوانیم (لە رووی دەروونیەوە) تێ پەڕاند بوو و لە زۆر هەست‌و سۆز کە خەڵکی پێیان وابوو نیشانەی منداڵیەتی و نا پوختەیی‌و نەخەملینە، بە تاڵ بوومەتەوە، زۆر شت هەن وێڕای لایەنی پێکەنیناوی رواڵەتیان، دەمهەژێنن. ئێستاش کە ئێستایە کاتێ لە سەرەتاکانی پایزدا دایکم هەموو ساڵێ کەلپەل‌و جل‌و بەرگی زستانەی منداڵەکان لە سەندوقان دەردێنێ تا وەکو دەڵێن بیانداتە هەتاو، دیتنی جلەکانی منداڵیەتیم، کە دایکم زۆری خۆش دەوێن، پشکنینی گیرفانەکانیان‌و دۆزینەوەی دەنکە نۆکێکی برژاو یان مێوژێکی گەنیو کە زۆرجار لە بنی گیرفانەکاندا ماونەتەوە، حاڵەتێکی سەیرم لە لا دروستدەکەن. لەپڕ خۆم ئەوەندە بچووك‌و پاك‌و بێ خەم‌و خەیاڵ دەبینمەوەو چەند دەنکە گەنمێکی برژاوو شادانە کە تێکەڵی کوڵکی بن گیرفانەکانم بوون، دەمبەنەوە بۆ ڕابردوویەکی دوور و هەمان ئەو هەستو سۆزە ناسك‌و شادە منداڵانەیەی ئەوسام لە دڵ‌و دەروونا بێدار دەکەنەوە. هێشتاش دەفتەری مەشق‌و راهێنانەکانی پۆلی دووەم‌و سێیەمی سەرەتاییم ماون. هەموو سەروەت‌و سامانی من ئەو کاغەزە شڕانەیە کە

**به درێژایی ساڵان کۆم کردوونەتەوەو بۆ هەر کوێیەك دەڕۆم دەگەڵ خۆمیان دەبەم. ئەو کاغەزانەی کە دەستی دۆستانم ڕۆژێ لە ڕۆژان نیشانەیەکیان لەسەر نەخشاندوون، خەتێکیان لەسەر کێشاون یان وێنەیەکیان تیا دروستکردوون، بە دیتنی هەر یەکێك لەوانە دەکەومە یادی یەکێك لەو ڕۆژە لە دەستچووانەی ژیانم و دەڵێی هەموو شتەکانم لەلا دووبارەو تازە دەبنەوە."***

(بڕوانە: **فروغ فروخزاد** خاطرات **سفر اروپا، مجله فردوسی، سالی نهم**).

**بابی فروغ – سەرهەنگ محەمەد فروخزاد– بەپێی کارەکەی، ڕێبازێکی تایبەتی لە پەروەردەو تەربێتی منداڵەکانیا دەگرتە بەر. زۆر حەزی لێبوو وەکو سەربازانی سوپا، دەگەڵ سەختیو دژواریدا ڕایان بێنێ: "بابم، لە منداڵیەوە ئێمەی بە سەختی ڕاهێناوە، ئێمە لە نێو پەتۆی سوپاییدا خەوتووینو گەورە بووین، لە کاتێکا پەتۆی زۆر نایابو نەرم لە ماڵەکەماندا هەبووەو هەیە. بابم ڕێبازێکی تایبەتی لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیا گرتبووە بەر . من لە بیرمە کاتێ کە دەچوومە قوتابخانەی سەرەتایی، هەموو پشووەکەی هاوین دەگەڵ برایەکانمدا، لە ماڵەوە دادەنیشتمو کتێبی کۆنو بێ کەڵكو ڕۆژنامانی کۆنمان دەکرد بە زەرفو نۆکەرەکەمان زەرفەکانی دەبردو بە دوکانەکانی دەفرۆشتو چەند پارەمان لەم کارە بە دەست دێنا، جگە لە پارەی ڕۆژانە کە بابم دەیدایێ، بۆمان هەبوو بە کەیفی دڵی خۆمان خەرجی بکەین. بابم دەیویست بەم کارە تێمان بگەیەنێ کە: کار شەرم نییەو هەر کەسێك کە بتوانێ بە ڕەنجی بازووی خۆی نان بخوات هەقی ئەوەی هەیە کە ئاغاو گەورەی خۆی بێتو هەمیشە سەری بەرز بگرێت، لە کاتێکا کە ئێمە هیچ پێویستیەکمان بە کارکردن نەبوو و ئەوەندەی لە بیرم بێ، بابە هەمیشە بە جورێکی شایستە پێویستیەکانی ژیانو خوێندنی بۆ فەراهەمو دابین دەکردین، من ئەگەر بەلای ئەوانەی دەوروبەرمەوە کەسێکی متمانە بەخۆو سەرسەخت دیار بم، لەمەدا خۆم بە قەرزاریاری بابم دەزانم."*** (بڕوانە **هەمان سەرچاوەی پێشوو.**).

**ساتە خۆشەکانی منداڵی بەسەر چوون، فروغ چووە قوتابخانە و قۆناغی دەرس خوێندن دەستی پێکرد. ئەم ڕۆژگارانە، بە پێچەوانەی ڕابردووەوە، بەڕێڕەوێکی پڕ لە نورو بوکەڵە، شنەو باڵندەو روناکیو ئاودا نەدەڕۆیی:**

**أی هفت سالگی**
**أی** لحظة **شگفت عزیمت**
**بعد از تو هرچه رفت در انبوهی از جنونو جهالت رفت**
**بعد از تو پنجره که** رابطة **أی بود سخت زندهو روشن**
**میان ماو پرنده**
**میان ماو نسیم**
**شکست**
**شکست**
**شکست**
**بعد از تو ان عروسك خالی**

**كه هيچ چيز نمى گفت، هيچ چيز بجز اب، اب، اب**

**در اب غرق شد***

**(بڕوانە: ايمان بياوريم به اغاز فصل سرد، تهران: انتشارات مرواريد، ١٣٥٤، شعر "بعد از تو" ص٤٦– ٤٧).**

**بەرە بەرە دەورانى سەرەتايى بەسەر برد، دەورانێك كە ساتەكانى بەر لە ڕۆییشتن بەرەو ئەسارەت بوو، دەورانێكى بیرەوەرى ئەنگێزو حەسرەتبار:**

**ان روز ها رقتند**

**ان روزهاى برق خامۆش**

**كز پشت شيشه، در ا تاق گرم،**

**هردم به بيرون، خيرەمى گشتم**

**پاكيزه برف من، چو كركى نرم،**

**ارام مى باريد**

**گرماى كرسى خواب اور بود**

**من توندو بیٚ پروا**

**دور ازنگاه مادرم خطهاي باطل را**

**از مشق هاى كهنه خود پاك مى كردم**

**چون برف مى خوا بيد**

**در باغچه مى گشتم افسرده**

**در پاى گلدانهاى خشك ياس**

**گنجشك هاى مردەام خاك مى كردم***

**(بڕوانە: تولدى ديگر، تهران: انتشارات مرواريد، ١٣٥٦، شعر ان روزها، صص ١٠– ١٢)**

**ئەو ڕۆژانە ڕۆییشتن**

**ڕۆژانى بە بەفرى خامۆش**

**كە لە پشت پەنجەرەوە، لە ژوورى گەرمەوە**

**هەر كاتیٚ، نیگام دەبڕییە دەریٚ**

**بەفرى پاكیزەی من، وەكو كوڵكێكى نەرم،**

**بە ئارامى دەبارى.**

**گەرماى كورسیەكە خەوهێن بوو**

**من خێراو بیٚ پەروا**

**دوور لە نیگاى دايكم خەتە هەڵەكانم**

**لە مەشقە كۆنەكانى خۆم دەسڕییەوە**

**كە بەفر خۆشى دەكردەوە، كە بەفر دەخەوت**

به خەمینی بە باخچەکەدا دەگەڕام
لە پای گوڵدانانیو شکی یاس دا
چۆلەکە مردارەوە بووەکانم بە خاك دەسپارد.

***

لەم قۆناغەدا، فروغ حاڵەتی جیاوازی هەبوو: لە رووییەکەوە کیژێکی "شەیتانی بزێو بوو کە بە دارو دیوارا هەڵدەگەڕا، وەکو کوڕان دەچوو لەسەر ترۆپکی دەرختان دادەنیشتو بووکەڵە ئاسا بە رەفتارەکانی هەمووانی دێنایە پێکەنین"* و لە روویەکی ترەوە کیژێکی "خەمینی، بیانووگر، سەرسەختو هەستیار کە بە کەمترین هەنجەتو بیانوو بە سەعاتان بە دەنگی بەرز دەگریا."* (بڕوانە: سخنان پوران فروخزاد در مصاحبە با روزنامەی کیهان، ٢١/بهمن/ ١٣٥٠= ١٩٧١).

ئەنجام فروغ قۆناغی سەرەتایی تەواو کردو پێی نایە قۆناغی ناوەندی! ناوەندی خسرو خاور. چونکە بابی حەزی لە شیعرو ئەدەب بوو، بەرە بەرە ئارەزووی شیعر خوێندنەوەی پەیدا کردبوو، بەڵام لەم سەرو بەندەدا، زیاتر خووی دایە خوێندنەوەی شیعرو بەرەبەرە کەڵکەڵەی نووسینو گوتنی شیعری کەوتە سەر: "قەت ئەوەم لە بیر ناچێت کاتێ کە فروغ یەکەمجار شیعرێکی چکۆڵەی گوتو بە منی نیشان دا. من ئێستاش ئەو شیعرەم بە دەست خەتی فروغ لەلایە کە بە شێوازی نوێ بوو و بەم نیوە بەیتە "دوور لێرە، دوور لێرە" دەستی پێدەکرد، ئەو کاتانە فروغ لە قۆناغی خوێندنی دوا ناوەندی بوو."* (بڕوانە: سخنان پدر فروغ در مصاحبە با کیهان، ٢٤/بهمن/ ١٣٥٣= ١٩٧٤)

فروغ بە خۆی لەمبارەیەوە دەڵێت: "من کاتێ کە ١٣ یا ١٤ ساڵان بووم، غەزەلم زۆر دەنووسیو هیچ کاتێ بڵاوم نەدەکردنەوە. بە هەرحاڵ هەندێجار شیعرم دەگوت. هەروا خۆڕسك لە ناخمەوە هەڵدەقوڵا. رۆژی دوو سێ شیعر، لە موبەق، لەسەر مەکینەی خەیاتی، بە کورتیەکەی ملم پێوە دەنا. زۆر یاخی بووم. خۆ رسك شیعرم دەگوت. چونکە دیوان لە دووی دیوانم دەخوێندەوەو پڕ دەبوومو، سووکە بەهرەیەکیشم هەبوو. ناچار دەبوایە بە هەر شێوەیەك بووە خۆم بە تاڵ بکردایەتەوە. نازانم ئەمانە شیعر بوون یان نا، تەنیا ئەوەندە دەزانم کە زۆر "من"ی ئەو رۆژانە بوون، هەڵقوڵاوی ناخو راستگۆیانە بوونو دەزانم کە زۆر ئاسانو سادە بوون. من هێشتا دروست نەبوو بووم، زمانو فۆرمی خۆمو دنیای فیکری خۆم نەدۆزیبووەوە."* (بڕوانە: حرفهای با فروغ، ص٢٧– ٢٨).

فروغ لە پاڵ شیعر گوتندا، لە مەیدانی پەخشانیشدا پێشکەوتنێکی بەرچاوی ئەوتۆی هەبوو کە مامۆستای دارشتنەکەیان باوەڕی نەدەکرد کە ئەو نووسینانەی فروغ لە پۆلدا دەی خوێندەوە، هی خۆی بن: "یەکێك لە هاوپۆلەکانی فروغ دەیگوت: دەرسی داڕشتنو ئینشا بۆ فروغو لەلای فروغ ناخۆشترین دەرس بوو. هەمیشە دەیگوت: من لە داڕشتن بێزارم، چونکە ئینشای زۆر باشی دەنووسیو مامۆستای داڕشتن هەمیشە سەرزەنشتی دەکردو دەیگوت: فروغ تۆ ئەمانە لە کتێبانەوە دەدزی!"* (بڕوانە: مجله زن روز، اسفند ١٣٤٥= ١٩٦٦)

لەم کاتەدا کە لە قۆناغی دوا ناوەندی دەیخوێند (١٣٢٩)و تەمەنی لە شازدە ساڵ زیاتر نەبوو، لە ناکاوا شووی کرد: "فروغ لە پۆلی حەوتەم بوو کە شووی بە پەرویزی شاپور کرد. پەروین، نەوەی پوری دایکمە: ئەو کاتانە زۆر هاتوچۆی ماڵی ئێمەی دەکرد. کەسێکی مەجلیس ئاراو زۆر بە تەنزە. منداڵەکانی لە دەوری خۆی دادەناو چیرۆکی کۆمیدی بۆ دەگێڕانەوەو فروغ بە دووچاوی ئەبڵەقەوە دەیڕوانییە زاری پەرویزو کاتێکمان زانی حەزیان لێکدی کردووە. هەموو واقمان وڕما، چونکە فروغ پۆلی حەوتەم بوو و شاپور زانستگەی تەواو کردبوو. یانی پازدە ساڵ لە فروغ گەورەتر بوو. کاتێ مقۆ مقۆی زەماوەند کەوتە سەر زاران‌و ئاشکرا بوو، بنەماڵەی ئێمە قاییل نەبوون، بەڵام بابم بە زوویی هاتە رەداو بەم زەماوەندە قاییل بوو. کاتێ شاپورو فروغ دەیانویست زەماوەند بکەن لە بیرمە کە شاپور نەیتوانی تەنانەت جلکی بوکێنیشی بۆ بکرێت. هیچی نەبوو، ئەمە بووە مایەی ناڕەزایی کەسوکارەکەمان، بەڵام فروغ مانی لە نان خواردن گرت، تۆرا کە من ئاهەنگی زەماوەندم ناوێ، جلك‌و جەواهێرم ناوێ، هیچ شتێکم ناوێ، ئەوە بوو کە زەماوەندەکەیان زۆر سادەو بە دوور لە هەر تەشریفاتێك ئەنجام درا."* (بڕوانە: پوران فروخزاد، هەفتەنامە بامشاد، شهریور / ١٣٤٧)

هۆی ئەم شووکردنە بە پەلەو زووە، هەندێ کێشەی خانەوادەیی بوو کە بنەماڵەکەی فروغ گیرۆدەی بوون: "باوکم حەزی لە ژنێکی دیکە کردبوو و دەیویست ئەو ژنە بخوازێت. وا دیارە ئێمە، یانی منداڵەکانی بە کۆسپ‌و رێگر دەزانی. ئەوە بوو کە منی بە پازدە ساڵی بە شووداو سەبارەت بە زەماوەندی فروغ‌و شاپوریش هەرچەندە کە هەموومان، بە هۆی جیاوازی تەمەن‌و وەزعی دارایی شاپورەوە- کە ئەوکاتە هێشتا هیچی نەبوو، ئەم زەماوەندەمان بە نەگونجاو دەزانی، کەچی بابم زوو هاتە رەداو قاییل بوو، چونکە دەیویست ئێمە لە کۆڵ خۆی بکاتەوە. زەماوەندی بابم دەگەڵ ژنی دووەمیدا، ژیانی هەر هەمووومانی داغان کردو هەر یەکێکمانی توڕدایە سووچێکەوەو بابم لەبەر خاتری ئەو ژنە لەگەڵمانا، گرژو مۆن‌و نا میهرەبان بوو. فروغ کە حەزی لە شاپور کردبوو، لەبەر ئەوە بوو کە پتر تامەزرۆو عەوداڵی میهرەبانی‌و مەحەبەت بوو و لە ماڵی ئێمەدا باوکم جگە لە زبری‌و ساردوو سڕی‌و دڕدۆنگی چاوەڕوانی هیچی دیکەی لێنەدەکرد."* (هەمان سەرچاوەی بەری).

فروغ، پاش ئەوەی پۆلی سێیەمی ناوەندی تەواو کرد، چووە هونەرستانی خانمان‌و لەوێندەر خەیاتی‌و نیگارکێشی فێربوو. ماوەیەکیش دەچووە دەورەی فێربوونی نیگارکێشی لای مامۆستا عەلی ئەسغەری پتگەرو فێری شێوەکانی نیگارکێشی دەبوو.

لە ساڵی ١٣٣١دا، کە فروغ هێشتا هەڤدە ساڵی پڕ نەکردبووەوە، یەکەمین کۆمەڵە شیعری بە ناوی "ئەسیر" بڵاوبووەوە. ئەم کۆمەڵە شیعرە پاشتر لە ساڵی ١٣٣٤دا بە هەندێ دەستکارییەوە، چاپی دووەم کرایەوە.

لەم سەروبەندەدا، شیعرێکی فروغ لە یەکێك لە گۆڤارەکاندا بڵاوبووەوە کە کۆمەڵێك قسەو قسەڵۆکی دەربارەی فروغ لێکەوتەوە: "کاتێ شیعری " گوناهم کرد، گوناهی پڕ لەزەت" لە گۆڤارێکدا بڵاوبووەوە، هەراو هەنگامەیەکی زۆر لە نێو خانەوادەکەماندا بەرپا بوو. فروغ

جانتاكەی هەڵگرت‌و لە ماڵ ڕۆیی. هۆدەیەكی لە پشت ئامادەیی فەیروز كوهی بە كرێ گرت تا لەوێندەر بژی، لەو كاتەدا تەنانەت تاقە بالیفێكیشی نەبوو. من لە ماڵی مێردەكەم كەمێك شتم بۆ برد. وەزعی زۆر بە زەقی دیار بوو: پارەی نەبوو، كاری نەبوو، مووچەی نەبوو، لەوپەڕی تەنگانەدا بوو. فروغ بە خراترین هەلومەرج دەستی پێكرد."* (سخنان پوران فروخزاد در مصاحبه با روزنامەی كیهان، ٢٤/ بهمن/ ١٣٣٥).

بابی فروغ لەمبارەیەوە گوتویەتی: "ژیانی فروغ دوو قۆناغ بوو، كاتێ كە دەستی بە شیعر گوتن كرد هانمدا، بەڵام كاتێ كە شیعر گوتن بووە باعیسی ناوو ناتۆرە بۆی‌و خەریك بوو ژیانی خانەوادەیی ئەوی تێكدەدا ناڕەحەت بوو بووم، چونكە پێموابوو ئەم ڕێگەیەی ئەو هەڵی بژاردووە، دەبێتە مایەی لە بەین چوونی ژیانی خێزانی وی."* (بڕوانە، سخنان پدر فروغ در مصاحبە با روزنامەی كیهان، ٢٤/ بهمن/ ١٣٥٣).

دوور كەوتنەوەی فروغ لە بنەماڵەكەی خۆی، زۆری نەبرد: " تكام لە فروغ كرد تا ڕێگەم بدات كە دەگەڵ بابیدا قسان بكەم‌و ئاشتیان بكەمەوە تا فروغ بتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ماڵ، لێ لەو سەروبەندە فروغ سەبارەت بە بابی یەجگار نا ئومێدو بە گومان بوو. باوك‌و دایكی جیا بوو بوونەوەو باوكی ژنێكی دیكەی هێنا بوو."* (بڕوانە: طوسي حایری، هفتەنامە بامشاد، ١٢/ شهر یور/ ١٣٤٧).

بەڵام ئەنجام كاری ناوبژیوانیەكان سەری گرت: "بە بابی فروغم گوت: تۆ لە ماڵەكەتا ژوورێك بدە بە فروغ، خۆی ژوورەكە ئاوا دەكاتەوە. بابی قاییل بوو و ژوورێكی رووتی دایە فروغ... فروغ كاتێ بۆ ماڵی بابی گەڕایەوە رایەخێكی بۆ ژوورەكەی كڕی‌و ئیدی دۆست‌و ئاشنایان هەریەكەو شتێكیان بە دیاری بۆ هێنا كە بەو شتانە ژوورەكەی ئاوەدان كردەوەو لە بیرم دێ كە دووسێ جاران لەو ژوورەدا میوانداری كرد."* (بڕوانە: هەمان سەرچاوە).

گریزانم از این مردم كە با من
بە ظاهر همدم و یكرنگ هستند
ولی در باطن از فرط حقارت
بە دامانم دو صد پیرایە بستند
از این مردم كە تا شعرم شنیدند
بە رویم چون گلی خوشبو شكفتند
ولی ان دم كە در خلوت نشتند
مرا دیوانە أی بدنام گفتند*

(بڕوانە: اسیر، تهران: امیر كبیر ١٣٤٦، شعر "رمیدە" ص٢٠)

***

بێزارم لەم خەڵكەی كە دەگەڵ منا
بە رواڵەت هاودەم و یەكڕەنگن
لێ لە ناخا، لەبەر بچووكی خۆیان

دووسەد بوختانیان بۆ هەڵبەستم.
لەم خەڵکەی کە گوێیان لە شیعرم بوو
وەکو گوڵی خۆشبۆ بە رووما شکۆفانەوە
لێ لە مەجلیسی خەڵوەتا
بە دێوانەی بەدناویان کردم.

***

فروغ لە ساڵی ١٣٣٢ دا. دەگەڵ پەرویز شاپوری مێردیا چوو بۆ ئەهواز تا دەگەڵ ئەودا ژیانێکی نوێ دەست پێبکات.

شهری است در کناره ان شط که سالهاست
انموش خود بەروی من و او گشوده است
بر ماسەهای ساحلو در سایەهای نخل
او بوسەها ز چشمو لب من ربودەاست
شهری است در کناره ان شط پرخروش
بانخلهای درهمو شبهای پر زنور
شهری است در کناره ان شط و قلب من
انجا اسیر پنجەی یك مرد پر غرور*
(بڕوانە: هەمان سەرچاوە، شیعر، "یادی ازگزشته" ص ٤٧- ٤٨).

***

شارێکە لە کەناری ئەو شەتەدا کە سالانێکە
هەمێزی خۆی بۆ منو ئەو کردووەتەوە
لەسەر لمەلانی کەنارەکەو لەسێبەرێن نەخلّ دا
ئەو راموسانانی لە چاو ولێوی من رفاندوون
شارێکە لە کەناری ئەو شەتە پڕ خرۆشەدا
بە نەخلێن تێك ئالاوو شەوانی پڕ نوور
شارێکە لە کەناری ئەودا شەتو دڵی من
لەوێ ئەسیری دەستی پیاوێکە پڕ غروور.

***

زۆری نەبرد کە فروغ جارێکی دی بۆ تاران گەڕایەوە، فروغو مێردەکەی نەیانتوانی بوو بسازێنو ناتەباییەکانیان وەلاوەبنەن، لەوەدەچوو کۆمەڵە ناکۆکییەك لە یەکدی دووری خستبنەوە. کوڕێکیان بوو بە نێوی (کامیار) ئەمە نەك هەر نەیتوانی ناکۆکی نێوانیان کەم بکاتەوە، بەڵکو زیاتری کرد: "فروغ تا ئەو کاتەی کامیار، کوڕەکەی، نەهاتبووە دنیاوە هێشتا نەبوو بوو بە ژن، منداڵ بوو. تا چواردە پازدە سالان زۆر ناشیرن بوو و ئەم ناشیرینیە رواڵەتیە زۆری ئازار دەدا. لێ کاتێ کامی هاتە دنیاوە، فروغ شکۆفایەوە، وەکو گوڵ کرایەوە. لە ناکاودا

جوان بوو و لەمە بەدواوە ناکۆکی نێوان ئەو و شاپور زیاترو توندتر بوو. ئەم ناکۆکیە ئەنجامو زادەی پەیوەندی سۆزداری وان نەبوو. فروغی خوشکم، ژنێکی مجێزسارد بوو. کە پێشوازی لە مەبەحەتی زۆر کەسان دەکرد، لە رووی سۆزداریو غەریزییەوە نەبوو، بەڵکو لەبەر کەمی ئەو مەحەبەتە بوو کە سەرانسەری دڵی سارد کردبوو. ئەنجام ناکۆکیەکان زیادیان کردو فروغ نەخۆش کەوتو مودەتێك لە ئاسایشگەی رەزاعی مایەوە. کە لە ئاسایشگەش هاتە دەرێ، ماوەیەکی زۆر وەزعی باش نەبوو... فروغ و شاپور خەڵکی دوو دنیای جیاواز بوون. فروغ پڕ هەست، نا ئارامو دیوانە بوو و پەرویز شاپور کەسێکی لوژیکی، بە حیسابو کیتابو پراگماتیكو پیاوێکی ئاسایی بوو کە وەکو هەموو پیاوان بەرخوردێکی تایبەتی دەربارەی ژیان نەبوو. ئەو دووە نەیاندەتوانی پێکەوە بسازێنو هەڵبکەن."* (بڕوانە: پوران فروخزاد، هفته نامه بامشاد، ٢٦/شهر یور/ ١٣٤٧).

سەرەنجام لە ساڵی ١٣٣٤دا دەخالەتی هەندێ لە دۆستانی فروغ، ئەم ناکۆکیانەی بەرەو جیابوونەوە برد: "هەوەڵین شتێك کە منو میهری رەخشا هەستمان پێکرد ئەمە بوو کە فروغو مێردەکەی هیچ گونجانو تەباییەکی دەروونیان لەنێواندا نیەو هەستمان کرد ئەم هاوسەرییە رێگە لە نەشونماو گەشەکردنی فیکری فروغ دەگرێت. من مێردەکەی، پەرویز شاپورم زۆر باش دەناسی. کاتێ کە دەگەڵ ئەحمەدی شاملودا دەژیام، شاپور زۆر دەهاتە ماڵمانو لەوە دەچوو کە ئەمانە بۆ یەکتری دروست نەبووبن. بە هەرحاڵ کاتێ ئەو رۆژەی ئاشنایەتیم دەگەڵ فروغ دا پەیدا کرد، زۆرم قسان دەگەڵ کرد، دەربارەی شیعرەکانیو، دەربارەی ئەوەی کە پێویستە رێگەی خۆی بناسێت قسانمان کردو پاشان – ئیدی غەڵەت بوو یان راست– کەمو زۆر هانماندا کە لە مێردەکەی جیا ببێتەوەو فروغ دوای پێنج شەش مانگ لە مێردەکەی جیا بووەوە."* (بڕوانە: طوسي حایری، هەفتەنامە بامشاد، ١٢/شهر یور/ ١٣٤٧).

جگە لە دەخالەتی خەڵکی، سەرسەختی خودی فروغیش فاکتەرێکی دیکەی ئەم جیابوونەوەیە بوو: "من دەگەڵ جیابوونەوەی لە مێردەکەی نەبووم، حەزم نەدەکرد جیاببێتەوە، بەڵام ئەو ئەوەندە مکوڕ بوو لەسەر راوبۆچوونی خۆی کە ئاقیبەت جیا بووەوە. ئاکارو رەفتاری فروغ تایبەت بە خۆی بوو، لە هەمان کاتدا لە رادەبەدەر میهرەبانو دلۆڤانو هەستیار بوو، بیروبۆچوونی تایبەتی خۆیشی هەبوو. هیچ شتو هیچ کەسێك نەیدەتوانی لەو فیکرەی هەی بوو یان لەو بڕیارەی دەیدا ژێوانی بکاتەوە. وێرای ئەوەی کە کاریگەریو دەسەڵاتێکی باوکانەم بەسەریەوە هەبوو، بەڵام وەختێ بڕیاری دەدا بە هیچ جۆرێ نەمدەتوانی کاری تێبکەم. هەر چەندە بە رواڵەت لەم خەسڵەتەی ناڕەحەت بووم بەڵام لە ناخا، لە دڵی خۆمدا ئافەرینو ستایشم دەکرد."* (بڕوانە: سخنان پدر فروغ در مصاحبه با روزنامەی کیهان، ٢٤/ بهمن/ ١٣٥٣).

فروغ لە دوای جیابوونەوە، هەندێجار ناچار دەبوو – ئەگەر بۆ ساتێکیش بووە– دەرگا لە رووی ئەندێشەێن پەشیمانی بکاتەوە: "فروغ، پەرویز شاپوری خۆش دەویست، ئەمەی چەندین جار گوتبوو. ئەگەر کەسێك لە پاشملەو، ئەو کاتەی کە جیا بوو بووەوە، قسەیەکی بە شاپور

گوتبا، هەرگیز تەحەمولی نەدەکرد."* (بڕوانە: پوران فروخزاد، هفتەنامە بامشاد، ٢٦/ شهر یور/ ١٣٤٧).

گفتم قفس، ولی چە بگویم کە پیش از این
اگاهی از دوو رویی مردم مرا نبود
دردا کە این جهان فریبای نقشباز
با جلوەو جلای خود اخر مرا ربود
اکنون منم کە خستە ز دام فریب و مکر
بار دگر بە کنج قفس رو نمودە ام
بگشای در کە در همە دوران عمر خویش
جز پشت میلەهای قفس خوش نبودە ام
پای مرا دوبارە بە زنجیرها ببند
تا فتنەو فریب ز جایم نیفکند
تا دەست اهنین هوسهای رنگ رنگ
بندی دگر دوبارە بە پایم نیفکند*
(بڕوانە: اسیر، شعر "بازگشت"، ص ١١٢).

***

گوتم قەفەز، لێ چ بڵێم کە لەمە پێش
من لە دووڕوویی خەڵکی بێ ئاگا بووم
سەد داخ کە ئەم دنیای فریبۆکو بێ وەفایە
ئاقیبەت منی ڕەدووی جیلوەو جەلالی خۆی خست.
ئەمە منم ماندووی داوی فریبو فێڵان
جارێکی دی رووم کردۆتەوە کونجی قەفەسان
دەرگا بکەوە کە لە هەموو تەمەنی خۆمدا
جێی خۆشی من هەر ناو قەفەز بووە
دووبارە پێوەندو زنجیرانم لە پێ مەکە
تا فیتنەو فریوان لە جێی خۆم هەڵمنەکەنن
تا دەستی ئاسنینی هەوەسێنو ڕەنگاو ڕەنگ
دووبارە پێوەندێکی دیکەم لە پێیان نەکات.

***

بەڵام حەقیقەتێکی پەنهانیش لەم جیابوونەوەیەدا هەیە کە نابێ بشاردرێتەوە. حەقیقەتە پەنهانەکە، ئەوەیە کە فروغ ناچار بوو لە نێوان شیعرو ژیاندا، یەکێکیان هەڵبژێرێتو بەو سەر سەختیە غەریزیو سروشتیەوە کە لە فروغ دا هەبوو، ["کاتێ دەڵێم: پێویستە، ئەم "پێویستە"یە ڕەنگدانەوەی جۆرە سەر سەختیەکی غەریزیو سروشتیە لە مندا... من لەو

بەشەرانە نیم کە کاتێ دەبینم کە سەری کەسێك بە بەرد دەکەوێ‌و دەشکێت، ئیدی پەند وەربگرم کە نابێ بەرەو بەرد بڕۆم. من تا سەری خۆم نەشکێنێ، لە مانای بەرد ناگەم!"*] ئەوە بوو لایەنی شیعری گرت‌و پەیوەندی سستی دوو ناو پچڕا . (بڕوانە: حرفهای بافروغ، ص ٢٧و ٢٩).

دانم اکنون کز ان خانهٔ دور
شادی زندگی پر گرفته
دانم اکنون طفلی به زاری
ماتم از هجر مادر گرفته
لیك من خسته جان‌و پریشان
می سپارم ره ارزو را
یار من شعرو دلدار من شعر
می روم تا به دست ارم او را*
(بڕوانە: اسیر، شعر "خانه متروك" ص ١٣٣- ١٣٤).

***

دەزانم ئەمێستا لەو ماڵە دوورەدا
شادی ژیان باڵی گرتووە
دەزانم ئەمێستا توڵفێك بەزاری
پرسەی بۆ هیجرانی دایك گرتووە
لێ منی شەکەت گیان‌و پەریشان
ڕێگەی ئارەزوو دەپێوم
یاری من شیعرو دڵداری من شیعرە
دەڕۆم تا بە دەستی بێنم.

***

یاسا، ئەم پەتکە قرچۆکەی عەدالەت، لە منداڵەکەی‌و تەنانەت مافی دیتنی منداڵەکەشی مەحروم کردو، فروغ شازدە ساڵی تەواو، تا کۆتایی تەمەنی، ئاشقی کوڕەکەی بوو کە هەرگیز نەی بینی‌و هەموو سوێندێکی بوو بە "گیانی منداڵەکەم". کاتێ کە چاوانی منداڵانەی ئەشقی ئەویان بە دەسەسڕی تاریکی قانون دەبەست، فروغ یاخیانە رووی کردە دڵبەستەگی‌و خۆشویستن‌و شێتانە خۆشویستن:

وقتی که اعتماد من از ریسمان سست عدالت اویزان بود
و در تمام شهر
قلب چراغهای مرا تکه تکه‌می کردند،
وقتی که چشمهای کودکانه عشق مرا
با دستمال تیرەی قانون می بستند

واز شقیقه‌های مضطرب ارزوی من
فواره‌های خون به بیرون می پاشید
چیزی نبود، هیچ چیز بجز تیک تاك ساعت دیواری
در یافتم: باید، باید، باید
دیوانه وار دوست بدارم*
(بڕوانه: ایمان بیاوریم به اغاز فصل سرد، شعر "پنجره" ص٦١- ٦٢).

***

کاتێ که متمانه‌ی من به پەتی سستی عەدالەتەوە ئاوێزان بوو
و له سەرانسەری شاردا
دڵی چراکانی منیان پارچه پارچه دەکرد،
کاتێ که چاوانی منداڵانەی ئەشقی منیان
به دەستماڵی تاریکی یاسا دەبەست
و لەلا جانگه شپرزەکانی ئارەزووی منەوە
خوێن فوارەی دەکرده دەرێ
هیچ نەبوو، هیچ شتێك جگه له چرکه چرکی سەعاتی چاڵمه
بۆم دەرکەو: دەبێ، دەبێ، دەبێ
شێتانه خۆشەویستی بکەم.

***

لەبەر خاتری ئەشقی شیعر، له ژیانی، له منداڵەکەی جیابوو بووەوەو هەنووکه شیعر بۆ ئەو لف‌و جووتێکی دیکه بوو، دۆستێکی دی بوو: "پەیوەندی دوو بنیادەم هیچ کاتێك ناتوانێ تەواو بێت یان تەواوکەر بێت، به تایبەتی لەم سەروبەندەدا. بەڵام شیعر بۆ من وەکو دۆستێکه که کاتێ دەیگەمێ دەتوانم به ئاسانی دەردە دڵی دەگەڵدا بکەم. لف یان جووتێکه که تەواوم دەکات، کامڵم دەکات... هەندێ کەس کێماسی‌و کەموکورتیانی خۆ له ژیاندا بەوە پڕ دەکەنەوە که پەنا بۆ خەڵکانی دی دەبەن، بەڵام قەتاو قەت پڕ نابنەوەو بەوە قەرە بوو نابنەوە. ئەگەر پڕ ببوایەتەوە یان قەرەبوو ببوایەتەوە، ئایا ئەم پەیوەندییه بۆ خۆی‌و له خۆیدا نەدەبوو به گەورەترین شیعری دنیاو بوون؟"* (بڕوانه: حرفهای با فروغ، ص٤٨).

شیعر بۆ فروغ دەلاقەو دەرکەیەك بوو که به "بوون"ـەوەی گرێ دەدا، شتێك بوو بۆ تاکیدی خودو بۆ خۆ دۆزینەوە: "شیعر بۆ من وەکو پەنجەرەیەکه که هەر کاتێ بەرەو ڕووی دەچم خۆ به خۆ دەکرێتەوە، من لەوێندەر دادەنیشم، تەمەشا دەکەم، گۆرانی دەڵێم، هاوار دەکەم، دەگریم، تێکەڵی سێبەرو وێنەی درەختەکان دەبم‌و دەزانم که لەو دیوی پەنجەرەکەوە فەزایەك هەیەو نەفەرێك گوێ دەگرێت، نەفەرێك که لەگینه سەدەیەکی دی ببێ یان سێ سەد ساڵ لەمەپێش هەبووبێ – فەرق ناکات – شیعر ئەوزارێکه بۆ پەیوەندی کردن به بوونەوە، به "بوون" به هەموو مانایەکەوە، به هەموو بەرینییەکی خۆیەوە. باشیەکەی لەوەدایه که بنیادەم وەختێ شیعر

دەڵێت، دەتوانێت بڵێت: منیش هەم، یان منیش هەبووم. دەنا چۆن دەشێت بڵێیت کە: من هەم یان هەبووم. من لە شیعری خۆما جستوجۆی هیچ ناکەم، بەڵکو شیعری خۆما، خۆم دەدۆزمەوە."* (بڕوانە: هەمان سەرچاوە).

شیعر بۆ فروغ بەرەبەرە دەبێت بە پرسێکی جدی. شیعر بۆ ئەو وەڵامێکە کە دەبێ بە ژیانی خۆیی بداتەوە: "ئێستا شیعر بۆ من پرسێکی جدیە. مەسئولیەتێکە کە لە هەنبەر بوونی خۆما هەستی پێدەکەم. جۆرە وەڵامێکە پێویستە بە ژیانی خۆمی بدەمەوە. من، چەند مرۆڤێکی مەزەبی ڕێزی مەزەبەکەی خۆی دەگرێت، ئەوەندە ڕێزی شیعر دەگرم." (بڕوانە: حرفهای با فروغ، ص٧٠). و بۆچی وا نەبێت، چونکە "شیعر لە بنەڕەتدا بەشێکە لە ژیان و هەرگیز ناتوانێ لە دەرەوەی ژیاندا هەبێت و لە بازنەی دەسەڵاتی ئەو کاریگەریانە بەدەر بێت کە ژیانی واقیعی لە بەشەری دەکات، بەدەر بێت، دەشێت بە "دیدی شاعیرانە" تەمەشای ژیانی مەعنەوی –تەنانەت ژیانی مادی–ش بکرێت. ئەسڵەن شیعر ئەگەر ڕەنگدانەوەی ئەو ژینگەو هەلومەرجە نەبێ کە تیایدا دێتە ئاراوەو گەشە دەکات و گوێی نەداتێ، هەرگیز ناتوانێ شیعر بێت."* (بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ص٧ و ٨).

بەڵام بۆ فروغ، ئەگەر شیعر بەشێك بوایە لە ژیان هەرگیز بەمجۆرە خۆی فیدای نەدەکردو خاچی مەرگی خۆی بەمجۆرە بە کۆڵا نەدەدا. شیعر بۆ ئەو هەموو ژیان بوو هەموو ساتەکانی ژیان بۆ ئەو ساتێن شاعیرانە بوون: "باوەڕم بە یەك شتی دیکەش هەیە ئەویش "شاعیر بوونە" لە تێکڕای ژیاندا! شاعیر بوون دەکاتە ئینسان بوون. هەندێ کەس دەناسم کە ڕەفتاری ڕۆژانەیان هیچ پەیوەندییەکی بە شیعریانەوە نییە، یانی تەنیا ئەو کاتانەی شیعر دەڵێن شاعیرن. کە تەواو دەبێت، دووبارە دەبنەوە بە بنیادەمێکی چاوچنۆکی نەوسنی زاڵمی، بیرتەسکی بەدبەختی حەسوودو بەغیلی بچووك، باشە، من قسەکانی ئەم بنیادەمانەشم قەبووڵ نییە. من زیاتر بایەخ بە ژیان دەدەم و وەختێ ئەم ئاغایانە کۆڵەمشتیان دەگوشن و هاوار دەکەن، یانی لە شیعرو وتارەکانیاندا، من ڕقم هەڵدەستێ، بێزار دەبم و باوەڕم نایەت کە ڕاست دەکەن، دەڵێم ناشێ ئەم هات و هاوارەیان تەنیا لە پێناوی قاپێ پڵاودا بێت! پێموایە ئەو کەسەی کە کاری هونەری دەکات، دەبێ لە سەرەتاوە خۆی دروست بکات و بخەملێنێ. پاشان لە خودی خۆی بێتە دەرەوەو وەکو یەکەیەك لە بوون و گەردوون تەمەشای خۆی بکات تا بتوانێت حاڵەتێکی گشتی بە گشت ئەنجامگیری، بیروهەستەکانی ببەخشێت."* (بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ص٧٠).

فروغ پاشان ئەوەی لە هاوسەرەکەی جیابووەوە، دەرفەتێکی بۆ ڕەخسا کە سەفەری هەندەران بکات، بەڵام ترسی دووری لە کوڕەکەی کە زۆری خۆشدەویست ئازاری دەدا: "نزیکی نیوەڕۆ بە مەبەستی دیتنی کوڕەکەم لە ماڵ وەدەرکەوتم، لێ نەمتوانی بیدۆزمەوە. ترسم لەم دیدارە هەبوو، بەڵام وەختێ بۆ ماڵ هاتمەوە، ڕێك بە پێچەوانەوەی تەسەوری خۆمەوە، سەیرم کرد لە کەنار مێزەکە دانیشتووەو دەگەڵ باب و داکما خەریکی نانخواردنە، چکۆلەو ڕەنگ بزرکاو بوو... بە دەستەکانی دەموچاوی نەوازشت کردم و هەستم کرد کە شتێك لە بوونمدا لە حاڵی توانەوەو پارچە پارچە بووندایە. هەنگێ لە لایەوە دانیشتم، نازانم بۆچی نەمتوانی نان بخۆم، دەستەکانم

بـەنج بـوو بـوون، وەخـتێ بـیرم دەکـردەوە کـە ماوەیـەکی زۆر، دوورو درێـژ دەسـتەکانم، دەسـتان، دەمووچاوو تەوێڵی ئەو نەوازشت ناکەن، دەتگوت ئازارێکی هۆڤی هەوسار پچڕیو، چنگ دەنێتـە سـەراپای بـوونم، دوای نیـوەڕۆژە هـەردووکمان پێکـەوە لەسـەر تەختەکـە ڕاکشـاین‌و مـن وەکـو هەمیشە چیرۆکم بۆ گوت. لەو حاڵەدا بیرم دەکردەوە کە ئەگەر من بڕۆم کێ قژی بۆ شانە دەکات؟ کێ جلی جوانی بۆ دەدروێت؟ کێ لەسەر کاغەز وێنەی فیل‌و قیتارو سێ چەرخەی بۆ دەکێشێت؟ کێ ئـەو خۆشەویسـتییەی مـنی دەداتـێ؟ مـن دەزانم کـە بـیرم هەسـت‌و سـۆزم لـەو سـاتەداو لەبـەر خـاتری ئـەو تـەواو بێهودەبـوون، چـونکە بـە هـەموو حـاڵ‌و حیسابێك لـە ژیـانی ئـەو چـوو بوومـە دەرێ، بەڵام نەمدەتوانی بیر لە شتێکی دیکە بکەمەوە."* (بڕوانە: فروغ فروخزاد، خاطرات سفر اورپا، مجله فردوسی، ساڵی نۆیەم). بە هەر حاڵ، فروغ لـە ساڵی ١٣٣٥دا بە مەبەستی سـەردانی ئیتاڵیـا بـەرەو رومـا ڕۆیـی. سـەردانی ئیتالیـا، بـۆ ئـەو تـەنیا بیـانوو بـوو، دەیویسـت خـۆی لـەو ژینگەیە ڕزگار بکات کە گیرۆدەی بوو بوو: "گوشاری ژیان، گوشاری ژینگەو گوشاری ئەو کۆت‌و زنجیرانەی کە لە دەست‌و پێم بەسترا بوون‌و من بە هەموو هێزو توانایەکی خۆمـەوە هـەوڵم دەدا لـە هەنبەریانـدا بـەرگری بکـەم. شـەکەت و مانـدوویان کردبـووم. مـن دەمویسـت "ژنێـك" واتـا "بەشـەرێك" بم، من دەمویست بڵێم کـە منیش مـافی هەناسـەدان‌و هـاوار کـردنم هەیـەو ئـەوانی دی دەیانویسـت هاوارەکـانم بەسـەر لێوانمـەوە هەناسـەم لـە سـینەمدا خەفـە بکـەن‌و بتاسـێنن. ئـەوان چـەکی تیـژو بڕنـدەیان هەڵبـژاردبوو و مـن نەمـدەتوانی زیـاتر پـێ بکـەنم، نـەك لەبـەر ئـەوەی پێکەنینەکانم وشکیان کردبوو، تـەواو بـوو بوون، نـا، بـەڵکو هێـزو توانـام تـەواو بـوو بـوو و مـن بـۆ ئـەوەی هێـزو وزەیـەکی تـازە بـۆ "سـەر لـە نـوێ پێکـەنین" بەدەسـت بێنمـەوە، لـە ناکـاو لێـبڕام کـە مودەتێك لـەم ژینگەیـە دوور بکەومـەوە."* (بڕوانـە: هـەمان سەرچاوەی بـەرێ.). و کـاتێ کـە لـەم ژینگەیە دوور کەوتەوە، زیاتر پەی بە بچووکی‌و لاوازی ئەو مرۆڤانە برد کە لە نێویاندا ژیا بوو: "بیرم لەو خاك‌و وڵاتە کردەوە کە بە فەرسەخان لێوەی دوور بووم‌و لەوێ نەدەبوو بەو شێوەیە بـێ کە هەبوو. لەوێندەر خەڵکانی لۆدەو لێبۆك‌و لاوازی ئەوتۆم بینی کە بە گوێڕایـەڵی‌و ملکەچیەکی دەسـتکردەوە سـەریان لـە بەرانبـەر ئـەو بتانـە دانەوانـد بـوو کـە سـاڵەها بـوو بـۆ خـۆ دروسـتیان کردبـوون‌و بـە خۆشـیان دەیـانزانی کـە بـە فەرسـەخان لـە ڕاسـتی‌و حەقیقەتـەوە دوورن، بـەڵام ئەوەنـدەیان زات‌و جورئـەت نـەبوو کـە بـە مشـت بـە تـەپڵی سـەری بتەکانـدا بکێشـن‌و لـەو دنیـا کۆمێدی‌و قێزەونـە بچـنە دەرێ کـە بـە دەسـتی خۆیـان بـۆ خۆیـان دروسـتیان کردبـوو."* (هـەمان سەرچاوە).

فروغ، دوای گەڕانەوەی بۆ ئێران، یەکسەر کەوتە کاری هونەری‌و داهێنانی خۆی: "فروغ زۆری دەخوێندەوە، هەموو شیعرەکانی سەعدی ئەزبەر بوو. غەزەلەکانی حافزی لەبەر بوو بۆ ساتێ دەستبەرداری خوێندنەوە نەدەبوو. بیرم دێت فروغ بەر لەوەی کارو دەرامەتێك پەیدا بکات، تەنیا شەش حەوت کتێبی هەبوو، بەڵام لەم دواییانەدا کتێبخانەیەکی ئاواو ئاوەدانی هەبوو. تامەزرۆی خوێندنەوە بوو و مێشکیشی زۆر بە باشی وەری دەگرت، هەر شیعرێکی دەنووسی یەکسەر لەبەری دەکرد. شیعری بە کەڕەتێك دەنووسی، ڕاستی نەدەکردەوە، تەواوی

دەکردو لەسەر کاغەزێك پاکنووسی دەکردەوە."* (طوسي حايرى، هفتەنامه بامشاد، ١٢/ شهريور/ ١٣٤٧).

لە ساڵی ١٣٣٦ کۆمەڵە شیعرێکی دیکەی فروغ بە ناونیشانی "دیوار" بڵاوبووەوە. کۆمەڵەیەك بوو کە هەرچەندە لە رووی نێوەڕۆکەوە درێژەی کۆمەڵە شیعری "ئەسیر" بوو، بەڵام نموونەیەکیش بوو لە پێشکەوتنی فروغ لە مەیدانی شیعرو بە دەست هێنانی ئەزموونێن تازە: "لە "ئەسیر"دا من تەنیا بە شێوەیەکی سادەو ساکار گوزارشتم لە دنیای دەرەوە کردبوو، لەو سەردەمەدا شیعر هێشتا لە مندا نەتوابووەوە، بەڵکو وەکو مێرد لە یەك ماڵ دەگەڵما بوو، وەکو ماشوق، وەکو هەموو ئەو کەسانەی کە چەند مودەتێك دەگەڵ بەشەر دان. لێ پاشان شیعر لە مندا رەگی داکوتاو لەبەر ئەمە بابەتی شیعر لەلام گۆڕا. ئیدی من شیعرم، تەنیا بە دەربڕینی هەستێکی تایبەت سەبارەت بە خۆم نەدەزانی، بەڵکو چەند شیعر لە ناخما، لە بوونما ریشاژۆ بوو، ئەوەندە پەڕاگەندەتر بوومو دنیاێن تازەترم دۆزییەوە."* (بڕوانە: مصاحبه صدرالدين الهى با فروغ، مجله سپيدو سياه، اسفند ١٣٤٥).

پاش ئەوەی ئەزموونی زیاتری پەیدا کردو بە شیعرو نۆڕینی جیاوازی شاملو بۆ "زمان" ئاشنا بوو: "کاتێ کە "شیعرێ کە ژیانە"ی شاملوم خوێندەوە، تێگەیشتم کە زمانی فارسی توانایەکی یەجگار زۆری هەیە. ئەم خەسێتو تایبەتمەندیەم لە زمانی فارسیدا کەشف کرد کە دەشێت بە سادەیی قسان بکرێت. تەنانەت سادەتریش لە "شیعرێ کە ژیانە" واتا بە هەمان ئەم سادەییەی کە من ئا ئێستا من لەگەڵ تۆدا قسان دەکەم. بەڵام کەشف بەس نییە. باشە، وا کەشفەکەم کرد، ئەدی دواتر؟ تەنانەت لاسایی کردنەوەش ئەزموونی دەوێت. دەبوایە بە رەوتێکی سروشتی، لە دەروونو ناخی خۆماو بە گوێرەی پێویستیە بەدەنیو فیکریەکانی خۆم بەرەو ئەم زمانە بڕۆمو ئەم زمانە خۆ بە خۆ لە مندا دروست دەبوو: لە خەڵکانی دیدا دروست بوو بوو، ئێستا بڕێك وای لێهاتووە. من هزردەکەم کە لەم بوارەدا دەچوومە پێشێ، زۆرم کاغەزان رەش کردەوە. ئێستا وام لێهاتووە کە کاغەزی بۆر دەکرم، هەرزانترە...!"* (بڕوانە: حرفهاى با فروغ، ص١٩).

دوای ئەزموونانی زۆر، سەرەنجام فروغ، نیماو بەرینی نۆڕینی ئەوی ناسی: "من نیمام زۆر درەنگ ناسیو لەوەیە بە مانایەکی دی بشێت بگوترێ زۆر لە شوێنی خۆیدا. واتا دوای ئەزموونو وەسوەسەیەکی زۆرو گوزەراندنی سەردەمێك لەسەرگەردانیو لە هەمان کاتدا جسوجۆ. شاعیرانی دوای نیمام زۆر زووتر ناسین، بۆ نموونە شاملو وئەخەوان، لە چواردە ساڵیدا مەهدی حەمیدیو لە بیست ساڵیدا نادر پورو سایەو موشیری، شاعیرانی ئایدیالی من بوون، هەر لە هەمان سەروبەندا بوو کە لاهوتیو گولچین گەیلانیشم کەشف کردنو ئەم کەشفە سەرنجی بۆ کۆمەڵێك جیاوازیو پرسێن تازە ڕاکێشام کە پاشان شاملو لە زەینی مندا شەکلو شێوەی پێدانو زۆر دواتر نیما کە باوەڕو سەلیقەی تەقریبەن یەکجارەکی منی سەبارەت بە شیعر " دروست کرد "و جۆرە بنجبڕییەکی پێ بەخشی... من ناتوانم بڵێم چۆنو لە چ زەمینەیەکدا لە ژێر باندۆرو کاریگەری نیمادا هەم یان نیم. ساغ کردنەوەو وردکردنەوەی ئەم

شتە کاری خەڵکانی دیکەیە. لێ دەتوانم بە دڵنیاییەوە ئەوە بڵێم کە لە رووی فۆرمێن شیعری و زمانەوە، سوود لە دەسکەوت و ئەنجامگیریە هونەرییەکانی. ئەو دەبینم، بەڵام لەلایەکی ترەوە — یانی لە بواری هاماجی فیکری تایبەت و ئەو شتەوە کە لە راستیدا روحی شیعرە– دەتوانم بڵێم: لەوەوە فێر بووم کە چۆن تەمەشا بکەم، یانی ئەو بەرینی نیگایەکی بۆ دیاری کردووم، کە من دەمەوێ بگەمە ئەو ئەو مەرزە. رەگ و ریشە شتێکەو، لێ ئەوەی کە دەڕوێت شتێکی جیاوازە، چونکە بەشەران جیاوازن. من بە هۆی تایبەتمەندییە روحی و ئاکارییەکانی خۆم — و بۆ نموونە تایبەتمەندی ژن بوونم– بە تەبیعەت پرسەکان بە شێوەیەکی دی دەبینم. من دەمەوێ روانینی ئەوم هەبێ بەڵام لە پەنجەرەی خۆما دانیشتبم... نیما چاوی منی کردەوەو گوتی: بڕوانە، تەمەشا بکە. بەڵام نۆڕینی خۆم فێر بووم. " (هەمان سەرچاوە، ل ٢٣– ٢٥).

کتێبی "عصیان" کە لە ساڵی ١٣٣٨= ١٩٥٩دا بڵاوبووەوە دوایەمین ئەزموونانی شاعیرێکی نیشان دەدا کە لە هەوڵی دۆزینەوەی ئۆتمۆسفێری شیعری تایبەتی خۆیدا بوو: "دیوارو عصیان لە راستیدا هەوڵ و تەقەلایەکی نا ئومێدانەیە لە نێوان دوو قۆناغی ژیاندا. دوایەمین هەناسەی پێش جۆرە رزگارییەکە. بنیادەم دەگاتە قۆناغی هزرین و ڕامان، لە گەنجیەتی دا، هەستە بەشەرییەکان رەگ و ریشەیان سست و لاوازە، لێ جەزەبەیان زۆرترە. ئەگەر پاشان لەلایەن فیکرەوە رێبەری نەکرێن و یان زادەو بەرەنجامی هزرین نەبن، وشك دەکەن و تەواو دەبن. من تەمەشای دنیای دەوروبەرم، شتان و مرۆڤانی دەوروبەرم و هێڵە سەرەکیەکانی ئەم دنیایەم کرد، کەشفم کردو وەختێ ویستم بە وتنی بسپێرم، سەیرم کرد پەیڤ و وشەم پێویستە. وشەێن تازە کە وشەی هەمان دنیا بن. ئەگەر بترساما یە دەمردم. لێ نەترسام، وشەم هێنان. جا ئەگەرئەم وشانە هێشتا نەبووبن بە وشەی شیعری چ قەیدیە، خۆ گیانیان تیایە، شیعریەتیان پێدەبەخشین!"* (هەمان سەرچاوە، ل٢٨).

ئەم ئەزموونانە فروغیان ناچارکرد کە جدیتر بیر لە مەسەلەی "زمان" بکاتەوەو بەم بیرکردنەوەیە لە "زمان"، شێوازی تایبەتی خۆی بدۆزێتەوە: "من لە شیعری خۆما، زیاتر لە هەر شتێکی دی هەوڵدەدەم ئەو کێماسی و نوقسانیەی چێدەبێت ناوی (کەمی وشەێن جۆراوجۆر)ی لێ بنرێت. شیعری ئێمە بڕێك سوننەتی و تەقلیدیە، هەندێ وشە هەن کە بەردەوام لە شیعرا دووبارە دەبنەوە. ئەمانە چەمکی خۆیان لە دەست داوەو چەمك و ماناکانیان لە گوێی ئێمەدا کاریگەریی واقیعی خۆیان نییە.

لەلایەکی ترەوە، ئەو وشانەی کە هەڵگری سوننەتە شیعریەکەن، دەگەڵ هەستی شیعریی ئەمڕۆی ئێمەدا تێك ناکەنەوە، چونکە ژیانی ئێمە گۆڕاوەو پرس و مەسەلەێن نوێ هاتوونەتە ئاراوە کە هەستی تازەمان لا چێدەکەن و ئێمە بۆ دەربڕینی ئەم هەستانە پێویستمان بە کۆمەڵێك وشەی نوێ هەیە کە چونکە لە شیعرا باو نەبوونە، هێنانیان بۆ ناو شیعر زۆر ئەستەمە. جا من هەوڵم بۆ ئەوەیە ئەم وشانە بێنمە ناو شیعرەوەو پێموایە ئەمە کارێکی دروستیشە، چونکە شیعری ئەمڕۆ، ئەگەر قەرارابێ شیعرێکی گیاندارو زندووبێ، پێویستە سوود لەم وشانە وەربگرێت و لە خۆیدا بەکاریان بێنێ."* (بڕوانە: هەمان سەرچاوە ل٦). هەڵبەتە ئەم کارە لە

فروغ دەوەشایەوە، چونکە وێڕای ئەو توانا ئەفراندنەوانیە عەجیبەی کە لێی هەڵوەقولا، هەوڵی دەدا ڕۆڵەی زەمان و ڕۆژگاری خۆی بێت و ئاوازو ریتمی زەمانی خۆی بدۆزێتەوەو تێبگات، نە لە ئەدەبی کلاسیکدا نقوم بێت و نە ڕەدوکەوتەو ئەفسوونی ئەدەبیاتی ئەوروپا بێت: "یەکێك لە خۆش شانسیەکانی من ئەمەیە کە نە زۆر خۆم لە ئەدەبیاتی کلاسیکی خۆماندا نقوم کردووەو نە زۆریش ئەفسوونی ئەدەبیاتی فەرەنگی بووم. من عەودالی شتێکم لە دەروونی خۆماو لە دنیای دەوروبەری خۆما... لە قۆناغێکی دیاری کراوا کە لە رووی ژیانی جڤاکی و فیکریی و ڕەوت و رەوشی ئەم ژیانەوە، تایبەتمەندی خۆی هەیە، رازی کار لەمەدایە کە ئەم تایبەتمەندیە دەرك بکەین و ئەم تایبەتمەندییە بێنینە ناو شیعرەوە."* (بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل٣٢).

فروغ لە پاڵ خەمی هونەرو داهێنانی خۆیدا، لە خۆشەویستی و خەمی کوڕەکەشی بە دوور نەبوو، هەم کوڕەکەی دەویست هەم هونەرەکەی، هەردووکیانی پێکەوە دەویست: "پێش هەموو شتێك و پتر لە هەر شتێك هونەرەکەم و پاشان کوڕەکەم خۆش دەویَ و ئاواتم ئەمەیە کە کوڕەکەم گەورە بوو ببیَ بە شاعیر یان نووسەر."* (بڕوانە: نامە فروغ، مجلە خوشە، نوروز/١٣٤٦). جا فروغ بۆ ئەوەی پەردەیەك بەسەر ئەم ترس و خەم و نیگەرانیانەی خۆیدا بدات، لە هەوڵی ئەوەدا بوو پەنا وەبەر خۆشەویستی بەرێت، خۆی لە بیرێن خەمناکی جودایی لە کوڕەکەی رزگار بکات: "بە تەواوەتی لە ژیانی رابردوو دابڕاوم. کاتیَ کامی لە جادەوبانان دەبینم کە ئێستا باڵای دەگاتە شانم، لەشم دەکەوێتە لەرزین و دڵم دەکەوێتە خورپە خورپ، لیَ نامەویَ، نامەویَ. سوودی ئەم خۆشەویستی و پەیوەندیانە چیە؟ مرۆڤ دەبیَ بۆ لفی خۆی بگەڕێت و، هەر کەسەو لفێکی هەیە، دەبیَ ئەو لفەی خۆی بدۆزێتەوە... چونکە ژیان تەنیا هەوڵدانە بۆ پڕکردنەوەو قەرەبووکردنەوەی نقوستانیەکان."* (بڕوانە: نامەی فروغ، مجلە فردوسی، ٢٧/مرداد/ ١٣٤٨). خەڵکی ئەم ڤیان و دڵبەستەییەی ئەویان بە جۆرێکی دی لێکدەدایەوەو لەم قسەیەی ئەو تێنەدەگەییشتن کە: "پەیوەندی دوو کەس هیچ کاتێك ناتوانیَ تەواو یان تەواوکەر بێت، بە تایبەتی لەم سەردەمەدا. لیَ شیعر بۆ من وەکو دۆستێکە کە کاتیَ دەیگەمیَ دەتوانم بە ئاسانی دەردەدڵی دەگەڵدا بکەم. لفێکە کە دەتوانیَ تەواوم بکات... هەندیَ کەس، کەموکورتیەکانی ژیانی خۆیان بە پەنا بردنە بەر خەڵکانی دی پڕو قەرەبوو دەکەنەوە، بەڵام قەت قەرە بوو نابێتەوە. ئەگەر قەرەبوو ببوایەتەوە ئایا ئەم پەیوەندیە، بە خۆی نەیدەکردە گەورەترین شیعری دنیاو بوون؟"* (بڕوانە: حرفهای بافروغ، ص٤٨).

خەڵکان، حەزیان دەکرد کە ڤیان و ئەشقی فروغ، دەگەڵ دڵبەستەگی و ڤیانە بازاڕیە باوەکانی ژیانی خۆیاندا، بە یەکسان بزانن: "بە نۆڕینی من ئەم قسانەی کە دەربارەی پەیوەندێن ئاشقانەی فەروخزاد کراون، هەر هەمووی بوختان و قسەیە. فەروخزاد مرۆڤێکی ئەوەندە تەنیا وشەکەت بوو کە ناچار بوو بۆ پەناگەیەکی روحی بگەڕێت و هەڵبەتە وەکو هەر بنیادەمێك بە تەبیعەت بیانوویەکی هەبوو و بۆ بیانوویەك دەگەڕا. لیَ هەستی مەرگ و تەنیایی و بیَ توانایی جەوهەرو کرۆکی فیکری فەروخزادەو لەبەر ئەمەیە کە شیعری وی مانایەکی سەیری دەگەڵ مردنەکەیدا پەیدا کردووە. فروغ، بە دەقیقی نەیدەزانی چی دەوێت، هەمەرەنگخواز نەبوو و

لەگەڵ ئەمەشدا لەگینە کە لە رۆژگاری ئاشنایەتیدا دەگەڵ گوڵستاندا، لە رووی سەرسەختی یان نائومێدیەوە جار جارێ رووی دابێتە یەك دوو کەسی دی، بەلام دڵینام کە ئەمە هەرگیز لە سنووری دۆستایەتی ڕاستگۆیانەو پاك هێوەتر نەچووە، چونکە فەروخزاد بە هۆی ئەم ئەزموونە تاڵەوەکە لە ڕابردووداو دەگەڵ خەڵکانی خەڵکانی رۆژگارانی رابردوودا هەی بوو، جگە لەوەی پشت بە یەك نەفەر ببەستێ و باوەڕ بە یەك پەناگا بکات، چاوی لە هیچی تر نەبوو."* (بڕوانە: م. ازاد، هفتەنامە بامشاد، ١٩/شهریور/ ١٣٤٧).

قسەی خەڵکی – مێرووی گەنیوی نێو مرداوان– کۆڵی پێنادەن، چونکە ئەو لە تیرەی درەختانەو هەوای کۆن قەڵسی دەکات، ئەو بیر لە رووناکیو خۆر دەکاتەوە نەك لە بیرێن جەنازەێن باکردووی مەیتخانەکانی ئەم جیهانەی کە لە هەوەڵی وەرزی ساردا دانیشتووە:

چەمی تواند باشد مرداب
چەمی تواند باشد جز جای تخم ریزی حشرات فاسد
افکار سردخانە را جنازەهای بادکردە رقم می زنند
نامرد، در سیاهی
فقدان مردیش را پنهان کردەاست
و سوسك،.... اه
وقتی کە سوسك سخن میگوید
چرا توقف کنم؟
من از سلالە درختانم
تنفس هوای ماندە ملولم می کند
پرندەای کە مردە بوو بە من پند داد کە پرواز بە خاطر بسپارم
نهایت تمامی نیروها پیوستن است، پیوستن
بە اصل روشن خورشید
و ریختن بە شعور نور.
طبیعي است
کە اسیابهای بادی می پوسند
چرا توقف کنم*
(بڕوانە: ایمان بیاوریم بە اغاز فصل سرد، ص٩٢– ٩٣).

***

مرداو دەتوانێ چ بێ
دەتوانێ چ بێ جگە لە شوێنی گەرا خستنی مێرووانی گەنیو
جەنازەێن باکردوو، بیرێن مەیتخانان دەنووسنەوە.
نا پیاو، لە تاریکی دا
نامێرێنی خۆی شاردووەتەوە

و قالۆنچه،.... ئاه
کاتێ که قالۆنچه قسه دەکات
من بۆچی بوەستم؟
من له تیرەی درەختانم
هەوای خەفە، خەمبارو کزم دەکات
باڵندەیەك کەمردبوو، دەرسی دام که فێری فڕین بم
کۆتایی هەموو هێزەکان پەیوەست بوونە، پەیوەست بوون
به پرەنسیپی روناکی رۆژەوە
و رژانە ناو هەستی روناکییە.
ئاساییە
که ئاشەبایان دەسوێن، دەرزن
ئیدی بۆچی بوەستم؟.
***

فروغ، له شەهریوەری ١٣٣٧دا، شان به شانی شیعر رووی کردە فیلمسازیو له کۆمپانیای "گوڵستان فیلم"دا، که ئیبراهیمی گولستان بەڕێوەی دەبرد، دەست بەکار بوو: "سینەما بۆ من، شێوەیەکە له شێوەیەکانی دەربڕین. که من عومرێکه شیعر دەڵێم، مانای وانیه که شیعر تاقه ئەوزارو رێگەی دەربڕینه. من حەز له سینەما دەکەم. له هەر بوارێکی دیکەشدا، ئەگەر بتوانم کار دەکەم. ئەگەر شیعر نەبوو له شانۆدا کار دەکەم، ئەگەر شانۆ نەبوو، فیلم دروست دەکەم. درێژه پێدانیشی بەندە بەمەوە که قسەکانم درێژەیان هەبێ، هەڵبەتە ئەگەر قسەیەکم هەبێ."

یەکەمین کاری فروغ مۆنتاجی فیلمی "ئاگرێك" بوو: له ئوردیبەهەشتی ١٣٣٧دا بیره نەوتی ژمارە شەشی ئەهواز له کاتی هەڵکەندنیا گەییه چینێك له غاز. غازەکه گڕی گرتو گڕی شەوتاندۆخی ئاگرەکه دوای هەفتا رۆژ ئەوسا کۆنترۆڵ کراو کوژێنرایەوە. شاروخ گولستان لەم ماوەیەدا نزیکەی هەزارو پێنج سەد مەتر فیلمی کارکرد. فیلمەکه ناو نرا "ئاگرێك"و فروغ به مۆنتاجی ئەم فیلمە گیانی وەبەر، ئەم کارە قارەمانانەیەی پیاوانی کۆڵنەدەرو کۆشیار، خست. فیلمی نێوبراو، له ساڵی ١٣٤١= ١٩٦٢ له دوازدەمین ڤیستیڤاڵی کورته فیلمانی دیکۆمێنتاری ڤینیسای ئیتاڵیادا، میداڵی زێڕو نیشانی برونزی وەرگرت.

فروغ، له ساڵی ١٣٣٨دا، به مەبەستی شارەزاییو فێر بوونی چۆنیەتی ئامادەکردنی فیلم —به تایبەتی فیلمی دیکۆمێنتاری— سەفەری بەریتانیای کرد. له ساڵی ١٣٣٩دا، دەزگای نیشتمانی کەنەدا، ئامادەکردنی فیلمێکی دەربارەی رێوڕەسمی خوازگاری له ئێراندا، به "گولستان فیلم" سپارد. فروغ لەم فیلمەدا دەوری بینیو له ئامادەکردنیشیا رۆڵی کاریگەری بینی.

له ساڵی ١٣٤٠دا، له دروستکردنی بەشی سێیەمی فیلمی "ئاڤ و گەرما"دا چالاکیەکی شایستەی نواند. ئەم فیلمە که بەرهەمی ئیبراهیمی گولستانه له کۆبوونەوەی پەنجاو چوارەمی "بنکەی فیلم"دا (له خوردادی ١٣٤١=١٩٦٢) نمایش کراو له هەمان ساڵدا بوو که فروغ

ئامادەکردنی دەنگی فیلمی "موج و مرجان و خارا"ی لە ئەستۆگرت. "موج و مرجان و خارا" فیلمێکی سی و پێنج میلیمەتری چل دەقیقەیی بوو، لە سیناریۆو دەرهێنانی ئیبراهیمی گولستان بوو. ئەم فیلمە لە ساڵی ١٩٦٢دا خەڵاتی تایبەتی وەرگرت.

فروغ، بە مەبەستی دیتنی دەورەی کاری فیلمسازی، جارێکی دی سەفەری بەریتانیای کردو کە لەم سەفەرەی گەڕایەوە، فیلمی یەك دەقیقەیی "رۆژنامەی کەیهان"ی دروستکرد کە هەر چەندە فیلمێکی بانگەشەیی بوو بەڵام مایەی سەرنج بوو.

لە بەهاری ساڵی ١٣٤١دا چوو بۆ تەورێز تا ئامادەکاری بۆ دروستکردنی فیلمێك دەربارەی گولانی خۆرەوێکەوتان بکات. لە هاوینی ئەم ساڵەدا فیلمێك لە کۆمپانیای "گولستان فیلم" بە ناوی "دەریا" ئامادە دەکرا – کە لە چیرۆکی "چرا دریا توفانی شدە بود؟"ی سادقی چوبەکەوە وەرگیرا بوو– فروغ لەم فیلمەدا دەوری بینی و لە ئامادەکردنەکەیدا یارمەتیەکی زۆری گولستانی دا، لێ ئەم فیلمە بە نیوەچڵی مایەوە.

فروغ، لە پایزی ١٣٤١دا جارێکی دی چوو بۆ تەورێز، ئەمجارەیان سێ کەسی دیکەی دەگەڵ بوون و فیلمی مەکۆی گولان لە ماوەی مانەوەی دوازدە رۆژەی وی لەوێندەر، ئامادە کرا، کە ناوی "خانە سیاه است"ی لە خۆ گرت. دیالۆگەکانی ئەم فیلمە لە دەقێن مەزەبی ئیسلامی و تەوراتەوە وەرگیراون. "خانە سیاه است" لەسەر داوای" "ئەزموونی کۆمەك بە گولان" دروستکراو کاراکتەرەکانی ئەم فیلمە، لە گولانی ئاسایشگەی بابا باغی تەورێز بوون. فروغ لە گوت و بێژێکدا دەربارەی ئەم فیلمە دەڵێت: رۆژی یەکەم کە گولەکانم بینی زۆر تێکچووم. بە ڕاستی ترسناك بوو، کۆمەڵە خەڵکێك لەو گولخانەیەدا دەژیان کە هەموو تایبەتمەندی و هەستی هەر ئینسانێکیان هەبوو، لێ لە چارەو سیمای مرۆڤانی بێبەش بوون. ژنێکم بینی کە هەموو دەموچاوی بریتی بوو لە تاقە کونێك و لەو کونەوە قسانی دەکرد. بە ڕاستی ترسناکە، لێ من ناچار بووم کارێ بکەم متمانەم پێبکەن، لە راستیا بە باشی رەفتاریان دەگەڵ ئەمانەدا نەکرد بوو. هەر کەسێ کە چوو بوو بۆ لایان تەنیا تەمەشای عەیبەکانیانی کردبوو. لێ من، بە زاتی خوا، لەسەر سفرەکەیان دادەنیشم، دەستم لە زامەکانیان دەدا، دەستم لە پێیان دەدا کە خۆرە "گولی" قامکەکانیانی هەڵوەراند بوو. بەو جۆرە بوو کە گولەکان متمانەیان بە من پەیدا کرد. کە خوا حافیزیم لێدەکردن، هەموو دوعای خێریان بۆ دەکردم. ئێستاش کە ساڵێك بەسەر ئەو رووداوەدا تێدەپەڕێ ژمارەیەکیان هێشتا هەر نامەم بۆ دەنووسن و داوام لێدەکەن سکاڵانامەو عەرزوحاڵەکەیان بگەیەنمە وەزیری تەندروستی و پێی بڵێم کە لە برنجی گولەکان دەدزرێ، خواردنیان نیە، حەمامیان نییە، لەوێ پیاوێکی گولم بینی کە تەقریبەن تەواوی بەدەنی ئیفلیج بوو، لێوەکانیشی ئیفلیج بوون و بە دەست لێوی بەرز دەکردەوە تا بتوانێت قسە بکات. چاوەکانیشی کوێر بوون. بەو حاڵەشەوە هەر کە منی دەبینی دەیگوت: ئاخر من چەند کەڕەت عەرزوحاڵ بنووسم کە ژنەکەمم بۆ بنێرن، من گولم بەڵام ژنەکەم ساغەو دەیەوێ دەگەڵ مندا بژی. ژنانی گول زۆر سەیرن، هەموو جوانیەکی خۆیان لە دەست داوە، کەچی هەموو رۆژێ چاوان دەڕێژن. قامکەکانیان، کە گولی تێی داون، پڕن لە موستیلە، ملوانکەو بازنەکەی منشیان برد.

ژوورەکەیان پڕە لە ئاوێنەو کوژەکەی چاوەزار، ئیدی ئەوانیش بەشەرن..."* (بڕوانە: مصاحبە بافروغ، مجلە روشنفکر، سال ١١، اسفند/ ١٣٤٢).

لە ساڵی ١٣٤٢دا فیلمی "خانە سیاە است" لە فیستیڤاڵی فیلمی ئەڵمانیای ڕۆژاوادا، براوەی باشترین فیلمی دیکۆمێنتاری بوو. فروغ دەربارەی ئەم خەلاتە گوتویەتی: "ئەم خەلاتە بۆ من گرینگ نەبوو. گرینگ کارەکەم بوو، لەزەتی من لە کارەکەمدا بوو، خوای دەکرد بوکەڵەیەکیان دەدامێ، بوکەڵەیەکە دەکاتە چی؟ خەلاتیش بوکەڵەیە."

دەیەمین فیستیڤاڵی "اوبر هاوزن" لە چواردەمین دەورەی خۆیدا، خەلاتی گەورەی خۆی بۆ فیلمێن دیکۆمێنتاری بە ناوی فروغی فەروخزادەوە ناو نا. فیستیڤاڵی "اوبر هاوزن"ی ئەڵمانیای ڕۆژاوا یەکێکە لە فیستیڤاڵە هەرە بە سەنگو ئیحتوبارەکانی جیهان، دەستەی بەڕێوەبەری ئەم فیستیڤاڵە دروشمی خەلاتی گەورەی خۆی لە دیلۆگەکانی فیلمی "خانە سیاە است"ەوە هەڵبژاردبوو.

فروغ، لە ساڵی ١٣٤١دا، دەربارەی "ئامادەکردنی ڕۆژنامەیەك" جارێکی دی فیلمێکی بۆ ڕۆژنامەی کەیهان دروستکردو لە بەهاری ١٣٤٢دا بە مەبەستی ئامادەکردنی فیلمێك سیناریۆیەکی نووسی، بەلام نەیتوانی فیلمەکە بەرهەم بێنێ. لەمبارەیەوە دەڵێت: "من لەم سیناریۆیەدا هەوڵم داوە ژیانی ڕاستەقینەی ژنی ئێرانی نیشان بدەم. حەز دەکەم ئەم فیلمە لە یەکێك لە خانووە کۆنەکانی ئێراندا وێنە بگیرێت، ئەو خانووانەی کە ژوورەکانیان، یەك لە ناو یەکدان..."

فروغ، پاش ئەوەی شارەزایی تەواویی لە تەکنیكو هونەرەکاریانی سینەمادا پەیدا کرد، ڕووی کردە شانۆ، فروغ لە هەموو بوارە هونەرییەکاندا، تواناو بەهرەیەکی سەیری هەبوو و هەوڵی دەدا ئەم تواناو بەهرەیەی خۆی لە هەموو هونەرەکاندا بجەڕبێنێ. ئەوە بوو کە لە مانگی دەی/ ١٣٤٢دا لە شانۆنامەی "شەش ئەکتەر لە تاقیبی نووسەردا"ی لویچی پیراندیللو – نووسەری بە ناوبانگی ئیتالیایی– بەشداری کردو دەورێکی سەرکەوتوانەی بینی. دەڵێن فروغ شانۆنامەی "جانی پیرۆز"ی برنادشۆی، کە دەربارەی ژیانی جاندارکە، پاچڤە کرد بوو تا بە خۆی لەم شانۆنامەیەدا دەوری جاندارك بدینێ. هەروەها پاچڤەی سیاحەتنامەی هنری میللەر لە یونان دا بە ناوی "ئەستونی بەردینی ماروس" دراوەتە پاڵ فروغ، بەلام هیچ دەقێکی چاپکراوی ئەم پاچڤانە لەبەر دەستانین و ڕەنگە دەستنووسەکانیشیان لە هیچ شوێنێ نەبن.

فروغ لە بەهاری ساڵی ١٣٤٣دا، لە دروستکردنی فیلمی "خشتو ئاوێنە"دا کە بەرهەمی کۆمپانیای "گولستان فیلم" بوو یارمەتی ئیبراهیم گولستانی داو لە هاوینی ١٣٤٣دا چوو بۆ ئەوروپاو سەری ئەڵمانیاو فەرەنساو ئیتالیای دا.

لە پایزی ١٣٤٤دا دوو فیلم لەمەڕ ژیانی فروغ دروست کران: یونسکو فیلمێکی نیو سەعاتی دەربارەی ژیانی وی چێکردو برناردو برتولوجی-ش، فیلمێکی چارەکە سەعاتی دەربارەی ئەو چێکرد. فروغ لە بەهاری ١٣٤٥ سەفەرێکی ئیتالیای کردو لە دووەمین فیستیڤاڵی "پژارو"

بەشدای کرد.* (بڕوانە مجلە زن روز، ١٦/اسفند/ ١٣٤٥، و حمید شعاعی: نام اوران سینما در ایران، تهران: بی نا، ١٣٥٦).

فروغ سەرباری ئەم هەموو چالاکیە سوودبەخشانە هێشتا هەستی دەکرد کە دەیتوانی داهێنانی زیاتری هەبێت: " هەستدەکەم کە تەمەنی خۆم بە فیڕۆ داوەو زۆر کەمتر لەوە دەزانم کە دەبوایە بیزانم، رەنگە هۆیەکەی ئەمە بێ کە هەرگیز ژیانێکی روناکم نەبووە. ئەو ڤیانو زەماوەندە کۆمیدیەی لە تەمەنی شازدە ساڵیمدا روویدا، پایەی ژیانی ئایندەمی هەژاند، من هەرگیز لە ژیاندا رێنوێنێکم نەبووە. هیچ کەسێك لە باری فیکری دەروونییەوە پەروەردەی نەکرد بووم. هەرچییەکم هەیە، هی خۆمە، هەرچییەکم نیە، هەموو ئەو شتانەیە کە دەمتوانی هەمبێ، بەڵام کەچڕەوی‌و خۆ نەناسی‌و کوێرە کۆڵانەکانی ژیان، نەیان هێشتووە بەو شتانە بگەم."* (بروانە: نامە فروغ، ارش، شمارە ١٣، اسفند/ ١٣٤٥).

فروغ، هەرچەند هەوڵی دابوو لە رێگەی شیعرو فیلمسازی‌و شانۆوە، خۆی لە بیرکردنەوە لە کوڕەکەی –کە لێی دوور بوو– دوور بخاتەوە، بەڵام لە ناخا هەر لە خەمی ئەودا بوو: "من هیچ ئاواتێکی ترم لە دنیادا نییە. هەستدەکەم هەموو ئاواتەکانم هاتوونەتە دی، بەڵام دەزانم – یان وا خەیاڵ دەکەم– ئینسان ئەگەر ئاوات‌و ئارەزوویەکی نەبێت دەمرێت‌و ئەمەش بە ڕاستی ترسناکە، زۆر ترسناکە. دەترسم کوڕەکەم نەبینم، ئەمە زۆر ترسناکترە."* (بڕوانە: نامە ف. فروخزاد، مجلە روشنفکر، ٢٠/ ابان/ ١٣٤٧).

ئاقیبەت بۆ ئەوەی جێی خاڵی کوڕەکەی لە ژیانی خۆیدا پڕ بکاتەوە، کوڕێکی بە فرزەندی هەڵگرتەوە: "سەرەنجام کاتێ لە ساڵی ١٣٤١دا بۆ وێنەگرتنی خانەی گولان‌و ئامادەکردنی فیلمی "خانە سیاه است" بۆ مەشهەد رۆیی بوو حوسێنی چکۆلەی دۆزییەوە. حوسێن منداڵێکی چکۆلەو ساوای داك‌و بابێکی گول بوو کە لە خانەی گولاندا دەگەڵ ئەواندا دەژیا. فروغ، بە رەزامەندی داك‌و بابی حوسێن، حوسێنی دەگەڵ خۆیدا بۆ تاران هێنایەوەو لە جێگای کامی بە فرزەندی هەڵیگرتەوەو ناوی نا "ئەسفەندیار". لە زمانی فروغەوە دەگێرنەوە کە لەمبارەیەوە گوتوویەتی: فیکرو خەمی کامی بە رۆکی بەرنەدەدام، دەیکوشتم، لە ناوەوە دای دەتاشیم، کە حوسێن هات، ئارامتر بوومەوە. ئەسڵەن هەندێجار لە سیمای ئەم کوڕەدا کامی دەبینم. کاتێ کە دەستی دەگرم‌و یان قژی نەوزاشت دەکەم هیچ بیر لەوە ناکەمەوە کە ئەمە حوسێنە یان کامی، هیچ فەرقێك ناکات، ئەوەندە دەزانم هەستدەکەم کوڕی خۆمە."* (بڕوانە: هفتەنامە بامشاد، ٣٠/مهر/ ١٣٤٧).

لە ساڵی ١٣٤٣دا کتێبی "تولدی دیگر"ی بڵاوکردەوە، کتێبێك بوو کە فروغ لەوێدا نیشانی دا کە زمانی تایبەتی خۆی دۆزیوەتەوەو شیعری وی لە نوێ لە دایك بووەتەوە. بەڵام هەستی کەماڵخوازی کە لەو – ولە هەر هونەرمەندێکی دی– دا هەیە، دەکاتە کارێك کە ئەم کتێبەش تینویەتی نەشکێنێ: "من دەربارەی کارەکانی خۆم قازیەکی زالمم... وەختێ تەمەشای کتێبی "تولدی دیگر" دەکەم. بەروبوومی چوار ساڵی ژیان! (١٣٣٨– ١٣٤٢) زۆر کەمە. من تەرازووم بە دەستەوە نەگرتووەو شیعرەکانی خۆم کێشانە ناکەم، لێ چاوەڕوانی لەوە زیاتر بووم‌و هەم.

شەویٚ کە دەمەویٚ بخەوم لە خۆم دەپرسم: ئەمڕۆ چیت کردووە؟ دەمەویٚ بڵێم عەیبی کاری من لەمەدایە کە دەکرا زۆر باشتر بێتو زۆر خێراتر گەشە بکات، بەڵام من لە بری ئەوەی کۆمەکم کردبێت، ڕێگەم گرتووە، بە تەمەڵیو فیڕۆدان، بە بیٚ موبالاتیو ڕەشبینی فەیلەسوفانەی هیچو ساردبوونەوەی زادەی بیر تەسکیو گەوجانە دەربارەی ژیان. عەیبی کاری من لەمەدایە کە هێشتا هەموو ئەوەی کە من دەمەویٚ بیڵێم ناتوانم بیڵێم. من تەمەڵم، زۆر تەمەڵم، هەمیشە لە لایەنە ئیجابیەکانی بوونی خۆم هەڵدێمو خۆم بە لایەنە نەرێنییەکان دەسپێرم.

من تەمەنم سی ساڵەو سی ساڵ بۆ ژن، تەمەنی کەماڵە، بە هەرحاڵ جۆرە کەماڵێکە. بەڵام نێوەڕۆکی شیعری من سی ساڵە نییە، گەنجترە. ئەمە گەورەترین عەیبی کتێبەکەی منە. پێویستە بە هوشیاریو هۆشمەندییەوە بژی، من کەسێکی شەپرێوو مشەوەش بووم، پەروەردەیەکی فیکری بنەما دروستم نەبوو، خوێندنەوەم پەراگەندە بووە، پچڕ پچڕ ژیاومو ئەنجامەکەشی ئەمەیە کە درەنگ بێدار بوومەتەوە — ئەگەر بشێت ئەم قسانە بە بێداری دابنرێت— من هەمیشە باوەڕم بە دوا شیعرم لە هەر شیعرێکی ترم زیاترە. ماوەی ئەم باوەڕەش زۆر کورتە، ئیدی بێزار دەبمو هەموو شتێکم ساویلکانە دێتە بەرچاو.

من چەندین مانگە کە لە کتێبی "تولدی دیگر" جیابوومەتەوە. وێڕای ئەمەش پێموایە دەشێت لە بەشی کۆتایی شیعری "تولدی دیگر"ەوە دەست پێبکەم، جۆرە دەستپێکردنێکی فیکری، هەستدەکەم دەتوانم "پری غمگینی کە در اقیانوسی مسکن داردو دلش در یك نی لبك چوبین من نوازد" بکەم بە سەرەتایەك."* (بڕوانە: حرفهای بافروغ، ص٣٩ و ٤١ و ٤٢).

فروغ بە کتێبی تەواو نەکراوی "ایمان بیاوریم بە اغاز فصل سرد" — کە دوای کۆچی دوایی فروغ بڵاوبووەوە— ئەو سەرەتایەی دامەزراندو توانی بەم کارەی تەنانەت شاعیرانی گەورەی سەردەمی خۆی سەر سام بکات: "شیعری فروغی فەروخزاد بەلای منەوە شتێکی ترە، شیعری فروغ هەندێجار لە نۆرینی منا شێوە پەڕجوویەك پەیدا دەکاتو من ئەو لە چوارچێوەی پێوەرێکی جیهانیدا، بە یەکێك لە شاعیرانی بەرجەستەی ئەم ڕۆژگارە دەژمێرم. گەلێك لەو شاعیرە ناودارانەی جیهان کە گوایە لەقەبی "گەورەترین"یان بە دواوەیە — بە باوەڕی من— هێشتا زۆریان ماوە بگەنە ئاستی فروغ. زۆر جار ڕێکەوتووە کە سەرم لە پارچە شیعرێکی فروغ سوڕماوەو، یان تا درەنگانیٚ ئەوسا توانیومە باوەڕی پێبکەم."* (بڕوانە: مصاحبە علی اصغر ضرابی با احمد شاملو، مجلە فردوسی، فروردین/ ١٣٤٥).

لیٚ خەڵکانێکیش هەبوون کە شیعری فروغیان پیٚ قووت نەدەچوو. زمان درێژانیٚ کە هەموو هونەرێکیان لە زەخمی زمانیاندا پەنهان بوو: "ڕەوشی ئەدەبیات وەکو جارانی خۆی بوو، چەنەبازیەکی زۆرو قسەکردنی ناپەسندو بێهودەو بڕێکی کەم کارکردن... من دڵم تێکهەڵدیٚو ئەوەندەی بتوانم هەوڵدەدەم خۆم لە پرتەوی ئەم پێوەرو ئامانجە گەوجانەو سواوو بازاڕیانە دوور دەگرم. من بیر لە دنیا دەکەمەوە، هەرچەندە ئومێدی دنیایی بوون زۆر کەمەو لە نرخی نەبوودایە، بەڵام باشیەکەی ئەمەیە کە ئینسان لە سنووررداریو چوارچێوەی ئەم ژینگە سیٚ بە چوارەو لەم مرداوی کرمانە رزگار دەکات. هەر نەبیٚ لە داوەری بنکەو مەڵبەندە بچووکە

هونەرییەکانی ئەم مەملەکەتە –کە بەدبەختانە تێ پەڕیوە– ناترسێت، و تەنانەت پێکەنینیشی پێی دێت."* (بڕوانە: نامە فروغ، دفترهای زمانە، بهمن / ١٣٤٦، ص٢٨).

لەم ساتانەدایە کە فروغ وەکو پێویستییەکی پێویست، وەکو پێویستی ئینسان بە هەوا، بیر لە شیعر دەکاتەوەو، ئەگەر شیعر لە ئاستی پێویستی هەوا بۆ ئینسان نەبوایە، ئایا ئەو، هەموو ژیانی خۆی فیدای شیعر دەکرد؟ لەم ساتانەدایە کە دەگەڵ هەر شیعرێکدا، دەستبەرداری بەشێکی گیانی خۆی دەبێتو بە شیعرەکەی دەبەخشێت: "شیعر بۆ من پێویستیە، پێویستیەکی باڵاتر لە خواردنو خەوتن، شتێکە وەکو هەوا بۆ هەناسە. مەبەستم ئەمەیە کە ئەم پێویستیە بۆ من زەرورەتێکە ناتوانم دەسبەرداری بم. شیعر لە منا بڵاوبووەتەوە، سەردەمانێك من ئەم بوونەوەرەم دەگەڵ شتەکانی دیدا، لە شێوەی شتێکی مجەڕەداو لە دەرێی خۆمدا وێناو تەسەور دەکرد، نها مودەتێکە هاتووەتە ناومەوە، یانی منی فەتح کردووەو لەبەر ئەمە من لە شیعر جیانیم. "ئەو کاتانە –واتە پێش ساڵی ١٣٤٢– باوەڕم بە شیعر نەبوو، کە دەڵێم باوەڕم نەبوو، ئەمەش چەند قۆناغێکی هەیە. سەردەمانێ بوو کە من شیعرم بە جۆرە سەرگەرمیو خۆشیەك دەزانی، وەختێ لە سەوزە پاککردن دەبوومەوە، بەدەم گوێ خوراندنەوە دەمگوت: ئێ، با بڕۆم شیعرێك بڵێم. پاشان زەمانێکی دی هاتە پێشەوە هەستم دەکرد ئەگەر شیعر بڵێم شتێکم بۆ زیاد دەبێت. ئێستا ماوەیەکە کە هەرکاتێ شیعر دەڵێم پێموایە شتێکم لێ کەم دەبێت، یانی شتێك لە خۆم دەبڕمو دەیدەمە خەڵکانی دی. بەمجۆرەیە کە شیعر بۆ من بووە بە کارێکی جدیو حاڵی حازر تاسووبێکی زۆرم بۆی هەیە. زەمانێك کاتێ کە شیعرم دەگوت گاڵتەم بە شیعرەکانی خۆم دەکرد، لێ ئەمێستا ئەگەر گاڵتە بە شیعری خۆم بکەم توڕە دەبم، چونکە زۆرم خۆشدەوێ. زەحمەتێکی زۆرم کێشا تا توانیم ئەم شتە غەریبە کێویە بۆ خۆم کەوی و رام بکەمو پاشان زەحمەتێکی زۆرم کێشا کە بیخمە ناو خۆمەوە، ئاوێتەی ببمو ئالکاوی یەکدی ببین، بە جۆرێ ئاوێتەی یەکدی ببین کە جیاکردنەوەمان ئاسان نەبێت."* (بڕوانە: مصاحبە صدرالدین الهی بافروغ، مجلە سپیدو سیاە، اسفند/١٣٤٥).

گوتراوە شیعری فروغ، دەنگی ژنی گەمارۆدراوی سەدان ساڵە، بەڵام ئەمە شتێك بوو کە تەنانەت خودی فروغیش هیچ حیسابو ئیحتوبارێکی بۆ نەدەکرد، شیعری ئەو چەند رەنگدانەوەو دەنگدانەوەی ئازاری ژنی رۆژگارو سەردەمی خۆیەتی، دەشێت رەنگدانەوەی دەردو ئازاری پیاویش بێت: "ئەگەر شیعری من کەمێك شەقڵو حاڵەتی ژنانەی لە خۆ گرتبێ، ئەمە زۆر ئاساییە چونکە بە خۆم ژنم، من خۆشبەختانە بابایەکی ژنم، بەڵام ئەگەر مەسەلە بێتە سەر هەڵسەنگاندنی بەهای هونەری، پێموایە هەنگێ مەسەلەی جێندەرو رەگەز هیچ رۆڵێك نابینێ. تەرح کردنی ئەم مەسەلەیە لە بنەڕەتدا دروست نییە، ئاساییە کە ژن بە هۆی هەلومەرجی فیزیولوجی بەدەنی، هەستەوەری و دەروونی خۆیەوە، گرینگی بە هەندێ مەسەلان بدات کە لەوەیە بۆ پیاوو بەلای پیاوەوە خەم نەبێتو، راو بۆچوونێك لەمەڕ هەندێ پرسان بدات کە لە راوبۆچوونی پیاو جیاواز بێت. من پێموایە ئەو کەسانەی کە کاری هونەری بۆ گوزارشتکردن لە بوونی خۆیان هەڵدەبژێرن ئەگەر قەرار بێ رەگەزی خۆیان بکەن بە مەرزو ئاقاری کارە

هونەرییەکەیان، پێموایە هەمیشە لەو چوار چێوەو مەرزەدا دەمێننەوەو ئەمەش بە ڕاستی کارێکی دروست نییە. من ئەگەر وا بیر بکەمەوە چونکە ژنم، کەواتە دەبێ هەموو کاتێ سەبارەت بە ژنایەتی خۆم قسان بکەم، ئەمە نەك هەر وەکو شاعیرێك بەڵکو وەکو بەشەرێکیش، نیشانەی وەستانە، جۆرە لە نێوچوونێکە، چونکە ئەوەی گرینگە، ئەوەی کە مەسەلەیە، ئەمەیە کە بنیادەم لایەنە ئەرێنییەکانی بوونی خۆی بە جۆرێ پەروەردە بکات کە بگاتە ئاستێك لە بەها مرۆڤانیەکان. ئەسڵی مەسەلەکە بنیادەمە، ژن و پیاو لە ئارادا نییە. بە هەر حاڵ من وەختێ شیعر دەڵێم ئەوەندە گوێم لەم بابەتە نییەو ئەگەر بێتە ئاراشەوە، بە شێوەیەکی نا ئاگایانەیە، خۆڕسکە."* (بڕوانە حرفهای بافروغ، ص ٢١ و ٢٢).

ئەو دەردەی کە لە شیعری فروغ دا شەپۆل دەدا، برینی زارکراوەی ئینسانی ڕۆشنبیری سەردەمی ئەوە، ئینسانێك کە لە پاش شۆرشی پیشەسازی، لەسەر چوار ڕیانی زەوال و نەمانی بەهاکان ڕاوەستاوەو هێندەی سزای دژوارو سەخت کێشاوە کە ئەو پەیڤە پیرۆزە لە هزرو بیری هەڵاتووە !و فروغ کە شیعر دەڵێت بۆ ڕوو بە ڕووبوونەوەی ئەم زەواڵ و نەمانەیەو بەرخودانە لە هەنبەر زەواڵێکی گەورەتر کە مەرگە: "لە زەمانێکا دەژین کە تێکڕای چەمك و پێوەرەکان خەریکن ماناکانی خۆیان لە دەست دەدەن و خەریکن – نامەوێ بڵێم بێ بایەخ دەبن– لە حاڵی لەق بووندان.... دنیای دەرەوە ئەوەندە ئاوەژووە کە نامەوێ باوەڕ بکەم.

من ناتوانم ئەوە روون بکەمەوە کە بۆچی شیعر دەڵێم. پێموایە هەموو ئەوانەی کە کاری هونەری دەکەن، هۆیەکەی – یا بەلای کەمەوە یەکێك لە هۆیەکانی– جۆرە پێویستیەکی نا ئاگایانەیە، بۆ روو بە ڕووبوونەوەو دژایەتی فەوتان و نەمان. ئەمانە (ئەهلی هونەر– وەرگێڕ) خەڵکانێکن کە ژیانیان زیاتر خۆشدەوێ و تێی دەگەن و هەروەها لە مەرگیش دەگەن. کاری هونەر جۆرە هەوڵێکە لە پێناوی نەمریدا یان جاویدانە کردنی "خود"و سڕینەوەی مانای مەرگ.

هەندێجار بیردەکەمەوە ڕاستە کە مەرگیش یەکێکە لە یاساکانی سروشت، لێ بنیادەم تەنیا لە هەنبەر ئەم یاسایەدا هەست بە بێدەسەڵاتی و بچووکی دەکات. مەرگ، مەسەلەیەکە هیچی لەگەڵدا ناکرێت، تەنانەت ناکرێت خەبات لە پێناوی لە نێو بردنیشیا بکرێت، فایدەی نیە، دەبێ ببێت، زۆریش باشە. ئەمە ڕاڤەو شرۆڤەیەکی گشتیە کە لەوەشە گەوجانە بێت."* (بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل٨، ٥٧، ٤٧، ٤٨).

"هەندێجار بیردەکەمەوە کە بە جێهێشتنی ئەم ژیانە بۆ من لە چاو تروکانێکا ئاساییە، چونکە دڵم بە هیچ شتێکەوە نییە. مرۆڤێکی بێ ڕەگ و ریشەم، تەنیا خۆشەویستییە کە دەمپارێزێ، بەڵام فایدەی چیە؟"* (بڕوانە: مجلە فردوسی، ٢٧/مرداد/ ١٣٤٨). ئەم زەواڵ و نەمانە شتێکە کە دەڕوانێتە هەموو جێیەك لەبەر چاوی ئەوە، تەنانەت ئاوێتەی ڤیانە گەورەکەی ئەوە!:

بە جۆرێ ئالودەیە
ئەشقی غەمناکم بەترسی زەواڵ
کە هەموو ژیانم دەلەرزێنێ*
(بڕوانە: تولدی دیگر، شیعر "گزران" ص١٨).

**هەروەها دڵە خورپەی وێرانی، هەر ساتێکی خۆشبەختی ئەو تەژی نائومێدی دەکات:**

**در شب کوچك من دلهره ویرانی ست**

**گوش کن**

**وزش** ظلمت **را می شنوی؟**

**من غەریبانە به این خوشبنجتی می نگرم**

**من به ئومیدی خود معتادم**

**گوش کن**

**وزش** ظلمت **رامی شنوی؟***

**"بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل ٣١).**

***

**لە شەوی بچووکی منا دڵە خورپەی وێرانیە**

**گوێ بگرە**

**هەڵکردنی تاریکی دەژنەوی؟**

**من غەریبانە دەڕوانمە ئەم خۆشبەختیە**

**من خووم بە نا ئومێدی خۆمەوە گرتووە**

**گوێ بگرە**

**گوێت لە شنەو هەڵکردنی تاریکی هەیە؟**

***

**ئەم ترس‌و نیگەرانیە لە وێرانی، لە هەموو جێیەك دەبینیٚ، ئەم نیگەرانیە لە مانگا دەبینیٚ‌و لەسەربانی ژوورەکەشیا نەمان‌و زەواڵ هێلانەی کردووەو ترسی هەرەس هێنان‌و داڕوخانی هەیە:**

**در شب اکنون چیزی می گزرد**

**ماه سرخ است‌و مشوش**

**و براین بام کە هەر** لحظه **در او بیم فرو ریختن است**

**ابرها، همچون انبوه عزاداران**

لحظه **باریدن را گویی** منتظرند.*

**(بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل٣١).**

***

**لە شەوا ئێستاشتێك دەگوزەرێ**

**مانگ سوورەو شێویاگ**

**و لەم سەربانە کە ترسی ئەوەی لێدەکرێ**

**لە هەر ساتێکا هەرەس بێنیٚ**

**هەوران، وەکو ئاپۆرای تازیەداران**

**لە تۆ وایە چاوەڕوانی دەمی بارینن.**

****

**لەم جیهانەدا کە لە بەرانبەر ئینسانی رۆشنبیری سەردەم، شکۆی کۆنکریتی هەموو ژیانی گرتووەتەوە ئایا لوتکەو بەرزییەك هەیە تا بدرێتە چاو تا بیگەتێ، لە کاتێکا ترسی زەوالْ لە هەر زەڕەیەکدا هێلانەی کردووەو مەرگ بەو دەمو زارە ساردو هەلْ لوشەرەی خۆیەوە هەموو ساتێك مرۆڤ بەرەو لای خۆی بانگ دەکات؟ فروغ ڤەبێژی (ڕاوی) ئەم ترسەی مرۆڤی سەردەمی خۆیەتی:**

**تمام روز، تمام روز**

**رهاشده، رهاشده چون لاشه أی بر اب**

**به سوی سهمناکترین صخره پیش میرفتم**

**به سوی ژرفترین غارهای دەریایی**

**و گوشتخوارترین ماهیان**

**و مهرەهای نازك پشتم**

**از حس مرگ تیر کشیدند.**

**کدام قله؟ کدام اوج؟**

**مگر تمامی این راههای پیچاپیچ**

**در ان دهان سرد مکنده**

**به نقطەء تلاقی و پایان نمی رسند؟***

(بڕوانە: **تولد دیگر- شعر "وهم سبز"، ص ١١٩).**

****

**تەواوی رۆژ، بە درێژایی رۆژ**

**وێلْ، وێلْ وەکو لاشەی سەر ئاو**

**بەرەو ترسناکترین تاوێر دەڕۆیشتم**

**بەرەو قووڵترین غارێن دەریایی**

**گۆشت خۆرترین، دڕندەترین ماسیان**

**و بڕ بڕە ناسکەکانی پشتم**

**بەدەم هەستی مەرگەوە**

**تەزوویان پێدا هات**

**کام قوللە؟ کام لوتکە؟**

**مەگەر هەموو ئەم ڕێگا پێچاو پێچانە**

**لە نێو ئەو زارە ساردە هەلْ لوشێنەرەدا**

**ناگەنە خاڵی یەکانگیری و کۆتایی؟**

****

بۆیه خاك بۆ ئەو، لای ئەو دەبێ بە رەمزی هێوریو ئارامی، رەمزی مەرگو ئاوێتە بوون بە خاك:

امروز، روز اول دی ماه است

من راز فصل ها من دانم

و حرف لحظه ها می فهمم

نجات دهنده در گور خفتەست

وخاك، خاك پزیرنده

اشارتی ست بە ئارامی.*

(بڕوانە: ایمان بیاوریم به اغاز فصل سرد، ص٢٤).

ئەمڕۆ، رۆژی یەکەمی دەی مانگە

من نهێنی وەرزەکان دەزانم

پەیڤی ساتەکان تێدەگەم

فریارەس لە گۆڕا نوستووە

و خاك، خاکی پەزێرا

ئاماژەیەکە بۆ ئارامی

***

فروغ جارێکیش رێگەی گەییشتن بە خاکی پەزێرای تا نیوە بڕی بوو، بەڵام دەستی تەقدیر جارێکی دی بۆ "جیهانی بێ موبالاتی فکرو پەیڤو دەنگانی کە لە لانەی ماران دەچن" گێڕا بووەوە: "پێنج شەش ساڵ لەمەپێش (١٣٤١– ١٣٤٢) فروغ جارێك هەوڵی خۆ کوژی دا. یەك پاکەت حەبی گاردنالی لە یەك جێ قووت دا. ئێوارە بوو کە کارەکەرەکەی پێی زانیو ئیدی بۆ نەخۆشخانەی ئەلبورزیان برد، کاتێ گەیینە نەخۆشخانە فروغ بێهۆش بوو، کاتێ کە لە مەترسی مەرگ دەرباز بوو، چەندمان لێ پرسی کە بۆچی ویستویەتی خۆی بکوژێت، تاقە وشەیەکی نەدرکاند، بەڵام کارەکەرەکەی پێی گوتین کە ئەو رۆژە دەگەڵ گولستاندا بەشەڕ هاتبوو و فروغ دوای ئەو قەرقەشەو گەنگەشەیە حەبەکانی خوارد. فروغ رەوشی دەروونی جیاوازی هەبوو، هەموو مانگێك دوو سێ جار تووشی قەیرانی دەروونی دەبوو کە لەم رۆژو حاڵانەدا لە هەموو کەسو لە گشت شتێك هەڵدەهات. دەرکەی ژوورەکەی لە خۆی دادەخستو دەگریا."* (بڕوانە: پوران فروخزاد، هفتەنامە بامشاد، ابان / ١٣٤٧).

فروغ، لە یەکێك لەم گۆشەگیریانەی خۆیدا نووسیویەتی: "زەینم مشەوەشەو دڵم تەنگەو تاقەتم لە تەمەشاڤانی چووە، هەر کە بۆ ماڵ دەگەڕێمەوەو بە تەنێ دەگەڵ خۆمدا دەبم، لە پڕ هەستدەکەم سەرانسەری رۆژەکەم بەسەرگەردانیو وێڵی لە نێو دنیایەك شتدا کە هی من نینو رەوتەنین بە فیڕۆ چووە. لە نێو ئەم هەموو ئاپۆڕای خەڵکە جۆراو جۆرەدا ئەوەندە هەست بە تەنیایی دەکەم کە هەندێجار گریان لە ئەوکمدا پەنگ دەخواتەوەو خەریکە شەق دەبات."* (بڕوانە: نامه فروغ ارش، ش ١٣/اسفند/ ١٣٤٥). دڵتەنگیو تەنیایی فروغ کۆتایی نەبوو: "دڵم

تەنگە... گیراوەو لێرە زۆر تەنیا کەوتومەتەوە. ئێوەش هەمووتان ڕۆییون، دایکم هەمیشە خەفەتبارەو باوکم مەگەر تەنیا سلاوی لێ بکەی. ئێستاش کە ئێستایە هەندێجار دادەنیشمو دەگریم."* (بڕوانە: نامەی فروغ، مجله فردوسی ٢٧/ مرداد/ ١٣٤٨).

فروغ وێڕای ئەوەی گەیی بووە لوتکەی کەماڵ، بەڵام وەکو گەلێك لە هونەرمەندان، باری مادی ژیانی لەوە کەمتر بوو کەلایەنی کەمی پێویستیەکانی ژیانی پێ دابین بکرێت: "لە بارێکی دارایی خراپدا دەژیم. زۆر جار لە ناوەڕاستی مانگدا تاقە پۆلێکم پێ نامێنێو کەسێکم نیە کە کۆمەکم بکات. ئێستا ناوەڕاستی زستانەو من هێشتا سۆپام نییە. ئەوەندە تەنیام وەکو سەگ کار دەکەم. ژیان ئەمەیە... هەمیشە تەنیایتو تەنیایی دەتخواتو دەت هاڕێت. من زۆر تێك شکاومو قژم سپی بووەو بیری ئایندە خەفەم دەکات."* (بڕوانە: نامەی فروغ، مجله فردوسی، ٢٧/ مرداد/ ١٣٤٨). "کێ دەزانێ کە فروغ بە ڕاستی چی بوو و کێ بوو؟ چ کەسێك جگە لەو سێ چوار کەسەی کە هەمیشە لەگەڵی بوون، گریەو حاڵاتە خەمناکەکانی ئەویان دیتبوو؟ کێ دەیزانی کە فروغ بە هەفتان نەخۆش دەبوو، لە جێدا دەکەوتو پارەی دکتۆرو دەواو دەرمانی نەبوو یان لە زستاندا، ئاگری سوپاکەی لە نیوەی هەر مانگێکدا لەبەر بێ نەوتیو بێ پارەیی دەکوژایەوە؟ فروغ، ئەو پارەیەی کە دەبوایە نەوتی پێ بکڕێ، بۆ خەرجی خوێندنی منی لە ئەڵمانیا، دەنارد یان خەرجی ئەو منداڵەی دەکرد کە لە خانەی گولان هێنابوویو بە فرزەندی هەڵی گرتبووەوە، یان دەیدا بە خەڵکانێك کە لەو دەست کورترو ئاتاج تر بوون. دوای ئەوە، بە سەعاتانو ڕۆژان بە تاقی تەنیا لە ژووری داخراودا دەمایەوە، بیری دەکردەوە، شیعری دەنووسیو لە شیعردا ژیانی خۆی بەرجەستە دەکرد. لە زۆربەی نامەکانیا ئەم رستەیە بەرچاو دەکەوت: ئێوە هەموو ڕۆییشتوونو من لێرە بە تاقی تەنیا ماومەتەوەو خەریکە لە تەنیاییدا دەمرم."* (بڕوانە: ف. فروخزاد، مجله فردوسی، بهمن/ ١٣٤٨).

هەرچەندە فروغ لە دوا قۆناغەکانی ژیانیا، لە ڕێگەی کاری سینەماییەوە سووکە خۆشگوزەرانیەکی بە دەست هێنا بوو، بەڵام وێڕای ئەوەش – بە پێچەوانەی گەلێك لە ژنانی هاو ڕۆژگاری خۆی– بایەخی بە مادیاتو کەمالیات نەدەداو حەزی لە سادەیی دەکرد: "سەرو وەزعی ڕواڵەتی بەلاوە گرینگ نەبوو. جلو بەرگی سادەو ئاسایی لەبەر دەکرد. موستیلەو بازنی لە دەست نەدەکرد. ئەم کارانەی بە بچووك دەزانی."* (بڕوانە: سخنان امیر مسعود فروخزاد در مصاحبە با روزنامە کیهان، ٢٤/ بهمن/ ١٣٥٣). "ئەوەی بیری لێنەدەکردەوە پارە بوو. کاتێ کە مرد، هەموو موڵكو ماڵەکەی بریتی بوو لە سیو حەوت تمەنو هەشت ڕیاڵو پاکەتێك جگەرە."* (بڕوانە: سخنان ف. فروخزاد در مصاحبە با روزنامە کیهان، ٢٤/ بهمن/ ١٣٥٣). بەڵام فروغ سادەییو ساکاریو خاکێتی خۆی ئاوێتەی سەلیقەی هونەرمەندانەی خۆی دەکردو جیلوەیەکی تایبەتی بە ژیانی خۆی دەدا: "ماڵەکەی زۆر چاكو بە سەلیقەو کەمێك ڕۆشنبیرانە رازاندبووەوە، دیار بوو ماڵەکەی خۆش دەویست. هۆڵی میوانەکەی بچووك بوو و شتی ناسكو بچووکی توحفەی تیادا دەبینرا. یەك دوو تابلۆی شێوەکاریشی بە دیوارەکانەوە هەڵواسی بوو کە بیرم نەماوە بەرهەمی کێ بوون."* (بڕوانە: م. ازاد، هفتەنامە بامشاد، ١٩/ شهریور/ ١٣٤٧).

فروغ به خۆیشی دەستی نیگارکێشی هەبوو: "زۆر باش‌و به ئاسانی له نیگارکێشی دەگەیی‌و هەستی پێدەکرد. شارەزاییەکی باشی له ڕەنگدا هەبوو و له سکێچ کاریدا به دەسەڵات بوو. یەك دوو مانگ پێش مردنەکەی، دووباره زەوقی نیگارکیشی پەیدا کردبووەوه. بۆیەی زەیتی کڕی‌و دوو تابلۆی کێشا که یەکێکیان پورترێتێکی حوسینه – منداڵی دایکێکی گول– که فروغ به فرزەندی هەڵی گرتبووەوه."* (بڕوانه: مجله زن رۆز، ١٦/ اسفند/ ١٣٤٥).

فروغ له بواری موسیقادا، جگه له مۆسیقای رۆژاوایی میانەیەکی تایبەتی دەگەڵ مۆسیقای ئێرانیدا هەبوو: "موسیقای ئێرانیم لەبەر خەمینی‌و خەمبارییەکەی خۆش دەوێ. من به تەبیعەت خەم دۆستم‌و لەزەت له رەنج‌و پەژاره دەبینم."* (بڕوانه: نامه فروغ، مجله خوشه، نوروز/ ١٣٤٦).

*    *    *

فروغ له ئاستانەی وەرزی ساردا:

فروغ، دوای ئەوەی قۆناغی یاخی بوونی بڕی، هەنووکه ژنێکه سی ساڵان، رۆژانی ڤیان‌و ئەڤینداری شێتانه ئیدی تەواو بوون‌و هەنووکه ژنێکه تەنیا:

ان روزها رفتند
ان روزها مثل نباتاتی که در خورشید می پوسند
از تابش خورشید، پوسید ند
و گم شدن ان کوچەهای گیچ از عطر اقاقی ها
در ازدحام پر هیاهوی خیابانهای بی برگشت
و دختری که گونەهایش را
با برگهای شمعدانی رنگ می زد، اه
اکنون زنی تنهاست
اکنون زنی تنهاست.*

(بڕوانه: تولدی دیگر، شعر "ان روزها"، ص ١٥و ١٦).

***

رۆییشتن ئەو ڕۆژانه
ئەو رۆژانەی چوون روەکان له هەتاوا سیس دەبن
له تیشکی خۆرا، دەژاکێن، دەچرمسن
کوچەو کولانانی مەست‌و گێژی بۆنی ئاقاقیا
له جەنجاڵی، پڕ هەراو هەنگامەی شەقامانی بێ
گەڕانەوەدا ون بوون.
و ئەو کیژەی که گۆناکانی
به گەڵای شەمانی دەڕەنگاند، ئاه
هەنووکه ژنێکه تەنیا

هەنووکە ژنێکە تەنیا.

***

ئەو رۆژانە رۆییشتن، هەنووکە ئەو و تەنیایی ماونەتەوە:

واین منم

زنی تنها

در استانه فصل سرد

در ابتدای درك هستی الوده زمین

ویأس سادەو غمناك اسمان

و ناتوانی این دستهایی سیمانی*

(بڕوانە: ایمان بیاوریم به اغاز فصل سرد، شیعر "ایمان بیاوریم، ص ٢٣).

***

ئەمە منم

ژنێکی تەنیا

لە ئاستانەی وەرزێکی ساردا

لە سەرەتای دەرکی بوونی ئالودەی زەوی

و نائومێدی سادەو غەمناکی ئاسمان

و بێ توانایی ئەم دەستە کۆنکریتیانە.

***

ئەنجام لە ئاستانەی سی و دوو ساڵیدا بیر دەکاتەوە: "خۆشحاڵم کە قژم سپی و نێوچەوانم چرچ بووەو دوو چرچی گەورە کەوتوونەتە نێوان برۆکانمەوە. خۆشحاڵم کە ئیدی خەیاڵاوی و خۆشخەیاڵ نیم. ئیدی خەریکە دەبم بە سی و دوو ساڵ، هەرچەندە کە سی و دوو ساڵی دەکاتە بەڕێ کردنی سی و دوو ساڵی تەمەن و چوون بەرەو کۆتایی، بەڵام لە قەرەبووی ئەوەدا خۆم دۆزیوەتەوە."* (بڕوانە: نامە فروغ، ارش، ش ١٣/اسفند/ ١٣٤٥). بەڵام هەستی تەنیایی و بێهودەیی گیانی پڕدەکات، ئەوجا دەگەڕێتەوە بۆ یادگاریانی ژیانی سەرڕێژ لە ناڵین خۆشبەختی و سروودی ئامانێن مسین، هەنگێ بیر نەکردنەوە لە پێشکەوتن و ئالوودەبوون بە نائومێدی خۆی کە هەموو کاتێ ڕۆچوون لە یادی ئەودا زندوو دەکاتەوە:

کام قوللە، کام لوتکە؟

پەنام بدەن ئەی کوانگانی پڕ ئاگر – ئەی ناڵێن خۆشبەختی –

وئەی سروودی ئامانێن مسین لە ناڕەواکاری موبەقدا

و ئەی ئاوازی خەمناکی چەرخی خەیاتی

و ئەی شەڕی رۆژو شەوی فەرش و گسکان

نەمدەتوانی، ئیدی نەمدەتوانی

دەنگی پێم لە ئینکاری رێگاوە هەڵدەستا

و نائومێدیم له سەبرو هەدای روحم بەرینتر بوو بوو

و ئەو بەهارە،و ئەو وەهمە سەوزە

که بە بەر دەرکەدا دەڕۆیی بە دڵی دەگوتم:

"تەماشاکە

تۆ هیچ کاتێ نەچوویتە پێشێ

تۆ رۆچوویت،

***

کدام قله، کدام اوج

مرا پناه دهید أی اجاقهای پر اتش –أی نعلهای خوشبختی–

وای سرودی ظرفهای مسین در سیاهکاری مطبخ

وای ترنم دلگیر چرخ خیاطی

وای جدال روزو شب فرشهاو جاروها

نمی توانستم، دیگر نمی توانستم

صدای پایم از انگار راه برمی خاست

و یأسم از صبوری روحم وسیع تر شده بوو

وان بهار، وان وهم سبز رەنگ

که بر دریچه گزر داشت با دلم می گفت:

"نگاکن

تۆ هیچگاه پیش نەرفتی

تو فرو رفتی.*

(بڕوانە: تولدی دیگر، شعر "وهم سبز" ص ۱۲۱و ۱۲۲).

***

بەو جۆرە هەموو بوونی خۆی وەکو نیشانەیەکی تاریکی دەبینیٚو دوای ئەوە، ئەندێشەو بیری زەواڵ و بێهودەیی و ئەوسا مەرگ زەینی پڕ پڕ دەکات:

من سردم است و می دانم

که از تمامی اوهام سرخ یك شقایق وحشی

جز چند قطر خۆن

چیزی به جا نخواهد ماند.

ما مثل مردەها هزاران هزار ساله بەهم می رسیم وانگاه

خورشید برتباهی اجساد ما قضاوت خواهد کرد*.

(بڕوانە: ایمان بیاوریم به اغاز فصل سرد، شعر "ایمان بیاوریم...." ص۲۸– ۲۹).

***

من سەرمامەو دەزانم

که لە تێکڕای وەهمە سورەکانی لالەیەکی کێوی
جگە لە چەند دڵۆپە خوێنێك
هیچی دی نامێنێتەوە
ئێمە وەکو مردوان هەزاران هەزار ساڵە بە یەك دەگەین‌و ئەوساش
خۆر قەزاوەت لەسەر فەوتانی جەستەمان دەکات.

خاکی پەزێرا ئاماژەیەکە بۆ ئارامی:

"من هیچ ئاوات‌و ئارەزوویەکی دیکەم لە دنیادا نیە. هەست دەکەم گشت ئاواتەکانم هاتوونەتە دی، لێ دەزانم، یا لەوەیە پێموابێ، بنیادەم ئەگەر ئاوات‌و ئارەزوویەکی نەبێ، دەمرێت‌و ئەمە بە ڕاستی ترسناکە، زۆر ترسناکە. دەترسم کوڕەکەم نەبینم، ئەمەیان زۆر ترسناکترە."* (بڕوانە: نامه فروغ، مجله روشنفکر، ٢٠/ابان/ ١٣٤٧).

"هەندێجار هزر دەکەم کە بە جێهشتنی ئەم ژیانە بۆ من لە چاو تروکانێکا مومکینە، چونکە دڵبەندی هیچ شتێك نیم."* (بڕوانە: نامه فروغ، مجله فردوسی، ٢٧/مرداد/ ١٣٤٨). و پێشتر گوتبووی: "دەترسم زووتر لەوەی تەسەوری دەکەم بمرم‌و کارەکانم بە تەواونەکراوی بمێنن."* (بڕوانە: هەمان سەرچاوە).

سەرەنجام ڕۆژی کۆتایی ژیانی فروغ (دوو شەممە، ٢٤/ بهمن/ ١٣٤٥) هات: "دوا ڕۆژ کە پێکەوە فراڤینمان خوارد سەعات سێی پاش نیوەڕۆ بوو. من هەستام تا بچم بۆ سەر کاری خۆم. ویستم ئەویش بگەیەنم. گوتی: تۆ ئەوەندە هێواش داژۆیت کە ئینسان بێ تاقەت دەبێ. دوایی بە ئوتومبیلێك ڕۆیی کە لە ستودیۆوە ناردبوویانە دووی..."* (بڕوانە: سخنان محمد فروخزاد در مصاحبه با کیهان، ٢٤/ بهمن/ ١٣٥٣).

فروغ لە ژیانا شەیدای "خێرایی" بوو: "مەسەلەی خێرایی بۆ من شت بوو. وەك بڵێی ئەم خێراییە وەڵامی خامۆشی‌و قەیرانی من بێت‌و سوکناییەکم پێ ببەخشێت. کاتێ بە خێرایی دەچمە پێشێ، ناتوانم بیر لە هیچ شتێك بکەمەوەو ئەمەم لە گیان خۆشە. هەستدەکەم باری مەسئولەتێکی قورس لەسەر شانم هەڵدەگیرێت. خۆم لەو ڕەوشە ڕزگار دەکەم کە بەپەلە بۆ پێشەوەم دەبات‌و ئەم ڕێ بڕینە، بۆ من جۆرە حاڵەتێکی نەفەس تازەکردنەوەی هەیە."* (بڕوانە: خاطرات سفر اروپا، مجله فردوسی، ساڵی نۆیەم.)

لە سەعات ٣ی پاش نیوەڕۆی دوو شەممەی ٢٤/ بهمن/ ١٣٤٥، فروغ بە خێرایی "بۆ ستودیۆ دەڕۆیی. فروغ منداڵ‌و باڵندانی زۆر خۆش دەویست. دەیگوت: ئەوانە پاکترن. ئەنجامیش گیانی خۆی لە پێناوی خۆشەویستی منداڵاندا دانا. فروغ کە دۆستی دێرینەی منداڵان بوو وەختێ بینی پاسی قوتابخانەی شهریار قلهك-ی سەرەتایی بۆ پێشی ئەو پێچی کردەوە، بۆ ئەوەی تامپۆن نەکات دەستی بە ڕاستا شکاندەوەو لە جادەکە دەرچوو. تەنیا بزەی تاقە منداڵێکی لە مەرگ ڕزگار بوو بۆ ئەو بەس بوو. ئەو لە شووشەی پێشی ئۆتۆمبیلەکەی خۆیەوە منداڵەکانی دەبینی کە بەترسەوە دەیانڕوانیە ئۆتۆمبیلەکەی ئەو کە خەریك بوو تامپۆنی دەگەڵ ئەواندا

دەکرد. ئۆتۆمبیلەکەی لە جادەکە لای دا بەڵام ئەوجاش نەیتوانی خۆی بگرێتەوەو لە پاسی منداڵەکان نەدات، بەر بۆدی ئۆتۆمبیلەکەی ئەوان کەوت، بەڵام تامپۆنەکە زۆر توند نەبوو، بەو حاڵەشەوە سەری فروغ بە هۆی توندی ئەو ئستۆپەوە کە گرتبووی بەر شووشەکەی پێشەوەی جێب ستێشنەکە کەوتو کەپووی لە ناوەڕاستەوە لەت کرد، زەربەکە ئەوەندە توند بوو کە دەرگای ئۆتۆمبیلەکە بە توندی کرایەوەو فروغ دەگەڵ پێشخزمەتەکەی ستودیۆی گولستاندا کە لە دوای جێبەکەوە دانیشتبوو، پەڕییە دەرەوە، لەو کاتەدا سەری فروغ لە دەرگای ئۆتۆمبیلەکە گیر بوو و گوێی چەپی ئاسیوێکی وەهای گەییشتێ کە خەریك بوو لێ دەبووەوە. هەنگێ فروغ بەسەرا کەوتو سەری بە شۆستەکە کەوتو سەری شکا. بۆ نەخۆشخانەیان برد، لێ مخابن کە ئیدی کار لە کار ترازا بوو."* (بڕوانە: دختر شورانگیز شعر، نوشته مسعود بهنود، مجله روشنفکر، اسفند/ ١٣٤٥).

لە نیوەڕۆی چوار شەممەی ٢٦/بهمن/ ١٣٤٥دا، خاکی پەزێرا –کە ئاماژەیەك بوو بۆ ئارامی– بەو زارە ساردە هەل لوشەرە – کە شێوەی گۆڕی وەرگرتبوو– ئەوی هەڵ لووشی: "ئامبولانسێکی سپی کە نقومی گوڵە بە هێمنی لە شەقامی گۆڕستانی ظهیر الدوله نزیك دەبێتەوە. زەمزەمەیەو بارانی فرمێسك ، جەنازەکە لە ئەمبولانسەکە دێننە دەرێ. ئەو بە هەمان ناسکی شیعرەکانی لە ژێر شاڵێکی تورمەییدا راکشاوە. ئەحمەدی شاملو، سیاوەشی کیسرایی، مەهدی ئەخوانی تالس، هۆشەنگ ئیبتهاج (سایە)، ساعدیو چەند کەسێکی دی تابووتەکەی دەگرنە سەر شان. دووبارە بارانو فرمێسك دەست پێدەکەنەوە. بەڵام سەڵای سەڵاوات باڵ بەسەر گریانو باراندا دەکێشێت. جەنازەکە بەسەر شانی ئەم چەند کەسەوە بەرەو گۆڕستانەکە دەبرێتو پاشان لە پای گۆڕەکەدا، لە عاردی دادەنرێت:

کدام قله، کدام اوج؟
مگر تمامی این راههای پیچا پیچ
در ان دهان سرد مکنده
به نقطه تلاقی و پایان نمی رسند؟*
(بڕوانە: تولدی دیگر، شعر "وهم سبز"، ص١٩).

***

کام ترۆپك؟ کام لوتکە؟.
مەگەر هەر هەموو ئەم ڕێگا پێچاو پێچانە
لەو زارە ساردە مژنەدا
ناگەنە خاڵی یەکانگیریو کۆتایی؟

***

کاری گۆڕ هەڵکەنەکان تەواو بووە. ئێستا خەریکن خشتو گەچ لە ناو گۆڕەکەدا هەڵدەچنن، فروغ هێشتا لە ژێر تۆپە شاڵە تورمەییەکەدا چاوەڕوانی گۆڕە. بارستایی دەستەکانی لە ژێر شاڵەکەوە دیارە... دەنگی گۆڕ هەڵکەنەکان بەرز دەبێتەوە، پاشان دەنگی سەڵاواتو ئەوجا

هەڵگرتنی جەنازەکە بەرەو گۆڕەکە. باران بۆ چەند ساتێك دەوەستێتەوە، بایی ئەوەی کە شاڵە تورمەییەکە لەسەر جەنازەکە لابرێت، پاش ئەوە بەفر بەفری پاك‌و سپی لە ئاسمانەوە دادەڕژێ، سپی تر لە کفنەکەی ئەو. ئەوەی سەراپا سپی پۆش، بە ئارامی لە گۆڕەکەی دەنەن. رەنگی سپی بەفر، زەویەکەو گۆڕەکەی داپۆشیوە."* (بڕوانە: پرویز لوشانی، مجله سپیدو سیاه، اسفند/ ١٣٤٥).

شاید حقیقت ان دو دست جوان بود، ان دو دست جوان
که زیر بارش یکریز برف مدفون شد
ایمان بیاوریم به اغاز فصل سرد
ایمان بیاوریم به ویرانەهای باغهای تخیل
به داس های واژگون شده بیکار
و دانەهای زندانی
نگاه کن که چ برڤ می بارد*
(بڕوانە: ایمان بیاوریم به اغاز فصل سرد، شعر "ایمان بیاوریم...." ص٤٢).
رەنگە حەقیقەت ئەو دوو دەستە جەوانە بێ، ئەو دوو دەستە جەوانەی
کە لە ژێر، بارینی یەکڕیزی بەفرا نێژرا.
باوەڕ بێنین
باوەڕ بێنین بە دەستپێکی وەرزی سارد
باوەڕ بێنین بە وێرانەکانی باغێن خەیاڵ
بە داسێن ئاوەژووی بێکار
و تۆوی زندانی.
تەمەشاکە چ بەفرێ دەبارێ.

***

سەرچاوە (دیوان اشعار فروغ فروخزاد، با مقدمه بهروز جلالی/ انتشاران مروارید/ چاپ چهارم ١٣٧٤= ١٩٩٥ ص ٩- ٥٠).

## سێیەم: فروغ لە شیعر دەدوێت

"من لەو کەسانە نیم کە دیتم یەکێك سەری بەر بەرد دەکەویٚو دەشکێ، ئیدی قەناعەت بەوە بکەم کە نابێ رووەو بەرد برۆی ،چونکە تا سەری خۆم نەشکێنێ لە مەعنای بەرد تێناگەم. دەمەوێ ئەوە بڵێم کە پاش خوێندنەوەی نیماش، گەلێك شیعری خراپم وتووە. من پێویستم بەوە بوو لە ناو خۆمدا گەشە بکەم، ئەم گەشە کردنەش زەمانی دەویستو زەمانی دەوێت. بە هەرحاڵ سەردەمێ شیعرم دەوت، شیعرەکانم بە شێوەیەکی خۆ بە خۆو غەریزی لە مندا هەڵدەقوڵێن.

رۆژێ دوو– سێ شیعرم دەوت. لە موبەق، لەسەر مەکینەی دروومان، بە کورتی دیوان لەسەر دیوانم دەخوێندەوەو پڕ دەبووم. لە پاڵ پڕ بوونەکەدا سووکە بەهرەیەکیشم هەبوو. ناچار دەبووایە ئەم پڕ بوونە هەڵڕێژم، نازانم ئەوانە شیعر بوون، یان نا، بەڵام ئەوە دەزانم کە زۆر زۆر لە منی ئەو رۆژانەوە نزیك بوون، بگریە پارچەیەك بوون لە منی ئەو رۆژانە، راستگۆو ئاسانو سادە بوون. من هێشتا دروست نەبوو بووم، زمانو شێوازو جیهانی فیکریی خۆم نەدۆزیبووەوە، لە ژینگە تەسكو چکۆلەکەی ژیانی خانەوادەیی دەرنەچوو بووم. پاشترو لە پڕ لە هەموو ئەو قسانە خاڵی بووم، ژینگەی خۆم گۆڕیو "دیوار"و "عصیان" لە ڕاستیدا باڵە فڕەیەکی نێوان دوو قۆناغی ژیانمن، دوا هەناسەی بەر لە جۆرە رەهاییەکن، مرۆڤ دەگاتە بیرکردنەوە، هەستەکان لە سەردەمی گەنجیدا وێڕای بریقەو جەزبەیان، ریشەیان سستە، ئەگەر پاشان فیکر رێنوێنیان نەکاتو لە بیرکردنەوەوە هەڵنەقوڵێن، دەپڕوێنو وشك دەبن. چاوم کردەوە، ڕوانیمە دەورو بەرو شتو خەڵکەکانی دەوروبەرم، ڕوانیمە هێڵە سەرەکییەکانی ئەم جیهانەو کەشفم کردن. کە هاتمە ئەوەی بیانڵێم، سەیرم کرد پێویستم بە وشەیە. وشەی تازەو تایبەت بە هەمان جیهان، ئەگەر ترسابام،دەمردم، بەڵام نە ترسام، وشەم پەیدا کرد، چبکەم گەر وشەکان هێشتا نەبووبن بە وشەی شاعیرانە! بەڵام خۆ گیانیان تێدا بوو، چ قەیدییە شیعریەتیان پێ دەبەخشم، وشە پەیدا بوون، ئەوجا مەسەلەی گۆڕینو دەستکاریی کێش هاتە پێشێ. ئەگەر ئەم پێویستییە خوڕسكو ئاساییە نەهاتبا پێشێ، کاریگەری نیما هیچی پێ نەدەکرا. نیما رێنوێنی من بوو، بەڵام دروستکەرەکە خۆم بووم. هەمیشە پشتم بە ئەزموونی خۆم بەستووە، دەبوا لە سەرەتاوە ئەوە کەشف بکەم کە نیما چۆن گەیووەتە ئەو زمانو فۆرمە.

گەر کەشفم نەکردبا چ فایدەیەکی نەدەبوو. ئەو دەمە دەبووم بە لاساییکەرەوەیەکی بێ ویژدان. دەبوایە ئەو قۆناغە ببڕم بۆ ئەوەی بژیم. کە دەڵێم دەبوایە، ئەم دەبوایەیە رەنگدانەوەی جۆرە سەر سەختییەکی غەریزیو سروشتیی منە. جگە لە نیما زۆری دی ئەفسوونیان کردم، بۆ وێنە نزیکترین شاعیر لە سەلیقەی شیعریو هەستی منەوە ئەحمەد شاملووە. کاتێ کە " ئەو شیعرەی ژیانە"م خوێندەوە، گەورەیی توانای زمانی فارسیم بۆ دەرکەوت. ئەم سیفەتەم لە زمانی فارسیدا کەشف کرد کە دەکرێ بە شێوەیەکی سادە قسە بکرێ. تەنانەت سادەتر لە "ئەو شیعرەی ژیانە"ش، واتە بەم سادەییەی کە ئێستا من قسەی پێدەکەم، بەڵام هەر کەشف کردن بەس نییە ئەدی پاش کەشفکردن چ دێ؟ تەنانەت لاسایی کردنەوەش ئەزموونی دەوێ.

دەبوایە بە شێوەیەکی سروشتی لە ناخی خۆمداو بەپێی پێویستییە حسیو فیکرییەکانی خۆم بەرەو ئەم زمانە سادەیە بڕۆم. ئەم زمانە بەرە بەرە و خۆ بە خۆ لە مندا دروست دەبوو. پێدەچوو بەرەو ئامانج بڕۆم... زۆرم کاغەز ڕەشکردەوە، وام لێهات کاغەزی بۆری ڕۆژنامە بکڕم، چونکە هەرزانتر بوو. من مرۆڤێکی سادەم، بە تایبەتی کاتێ کە دەمەوێ قسە بکەم، هەست دەکەم پتر پێویستم بە سادەیی هەیە. من هیچ کاتێ کێشی عەرووزم نەخوێندووە. ئەم کێشانەم لەو شیعرانەدا دۆزینەوە کە دەمخوێندنەوە، بۆیە بۆ منو بەلای منەوە کێشی عەرووز حوکم نەبوو، ڕێگەیەك بوو خەڵکانی دی پێیدا ڕۆیی بوون. یەکێك لە بەختەوەرییەکانی من ئەمەیە کە نە زۆر لە ئەدەبیاتی کلاسیکی خۆماڵیدا غەرق بوومو نە زۆر شەیداو ڕمودەی ئەدەبیاتی بێگانە بووم. من عەوداڵی شتێکی ناو ناخی خۆمو دونیای دەوروبەری خۆمم – هەڵبەتە لە قۆناغێکی تایبەتدا کە لە باری ژیانی کۆمەڵایەتیو فیکریو ئاهەنگی ئەم ژیانەوە تایبەتمەندیی خۆی هەیە– نهێنیی کار لەمەدایە کە ئەم تایبەتمەندییانە دەرك بکەینو بمانەوێ ئەم تایبەتمەندییانە بخەینە ناو شیعرەوە، بۆ من وشە زۆر گرینگە، هەر وشەیەك گیانو تامو بۆی تایبەتیی خۆی هەیە، هەروەها شتەکانیش، من گوێ بە پێشینەی شیعریی وشەو شتەکان نادەم. من چ بکەم کە تا ئێستا هیچ شاعیرێکی فارسی زمان بۆ وێنە وشەی "انفجار"ی لە شیعری خۆیدا بەکار نەهێناوە. من لە بەیانییەوە تا ئێواری کە دەڕوانم دەبینم شتێك لە حاڵی تەقینەوە "انفجار"دایە، بۆیە کە دەمەوێ شیعر بڵێم ناتوانم خیانەت لە خۆ بکەم. گەر دیدو بۆچوون، دیدو بۆچوونی ئەمڕۆ بێ، زمانیش وشەی خۆی پەیدا دەکاتو، وشەش ئاهەنگی خۆی. کە زمان بوو بە زمانێکی پوختەو پاراوو ڕاستگۆ، هەنگینێ وەزنو کێش خۆ بە خۆ، خۆی دەسەپێنێ.

من ڕستە بە هەمان سادەییەوە کە لە مێشکمدا دروست دەبێ، دەڕێژمە سەر کاغەزو کێشو وەزن وەك داوە دەزوویەکی باریکەو بێئەوەی ببینرێ بە نێو ئەو وشانەدا ڕەت بووە، تەنێ ئەوەیە کە وشەکانی گرتووەو ناهێڵێ بکەون. ئەگەر وشەی "انفجار" لە قاڵبی وەزندا نەگونجێو جۆرە وەستانێك دروست بکات، ئەوا با وەك گرێیەکی ئەو داوە دەزووە حسێب بکرێو دەشێت لەگەڵ گرێکانی دیدا یەك بخرێو جۆرە هاو ئاهەنگییەك پێك بێنن. چما نیما ئەم کارەی نەکردووە؟.

بە ڕای من ئیدی ئەو زەمانە بەسەر چووە "چەمك" بکرێ بە قوربانی وەزن. لە زمانی فارسیدا هێندێ وەزن هەن کە لە رووی توندیو سستی ریتمەوە پتر لە ئاهەنگی گفتوگۆوە نزیکن، دەشێت هەر ئەو وەزنانە وەربگیرێنو پەرەیان پێبدرێ. وەزن، دەبێ سەر لە نوێ دروست بکرێتەوە. ئەوەی کە وەزن پێکدێنێو دەبێ وەزن دروست کات بە پێچەوانەی جارانەوە زمانە، هەستی زمانو غەریزەی وشەو ئاهەنگی دەربڕینی زمان، وەزن دروست دەکات. بە هەرحاڵ مەسەلەی وەزن، مەسەلەیەکی ریازیومەنتیقی نییە – هەرچەندە خەڵکانێك هەن بە مەسەلەیەکی ریازیو مەنتیقی دەزانن– بەڵام لای من حسێکە دەبێ گوێم قبوڵی بکات. کاتێ لە من دەپرسن لە مەیدانی زمانو وەزندا گەییومەتە چی؟ تەنیا ئەوە دەڵێم گەییوومەتە ڕاستگۆییو سادەیی. نابێ ئەم مەسەلەیە بە شێوەیەکی ئەندازەیی ڕەسم بکرێ، دەبێ سادەترینو واقیعیترین وشە بێتە هەڵبژاردن. تەنانەت گەر شاعیرانیش نەبێ، دەبێ قاڵب بڕژێنرێتە ناو ئەم وشانەوە نەك وشە

بخرێته قاڵبەوە. وەزنە زیادەکان دەبێ لابدرێن، تێکدەچی؟ چش، چونکە ئەگەر هەستو وشەکانتان ڕەوانیو سواریی خۆیان هەبێ، ئەوا یەکسەر ئەم تێکچوونە پڕدەکەنەوە. هەر لەو تێکچوونانەوە دەشێت شتی تازە دروست بکرێ. ئەگەر گوێچکە مەداری قبووڵکردنو وەرگرتنی تەسك نەبێ، ئەم ئاهەنگە تازانە کەشف دەکات. خاڵی گرینگ لەمەدایە کە ئەم مەسەلەیە، واتە وەزنو زمان لێکدی جیا نین– پێکەوە دێنو کلیلی خۆیان لە ناو خۆیاندایە. دەتوانم نموونە بۆ ئەم حاڵەتە بهێنمەوە. با واز لە شاعیرە ناسراوەکان بێنینو شیعری "أی وای مادرم"ی شەهریار تەمەشا بکەین، دەبینین کاتێ شاعیرێکی غەزەلخوانی وەك شەهریار تووشی مەسەلەیەك دەبێ ناتوانێ چ کاردانەوەیەکی بەرانبەری هەبێ جگە لە ڕاستگۆیی، بۆیە وەزنو زمان خۆ بە خۆ ئاوێتە دەبنو لە ئەنجامدا شتێك پێك دێنن کە لە یەکێکی وەك شەهریار چاوەڕوان ناکرێ. ئەم شیعرە ئەنجامی سەرنجدانێکی ڕاستگۆیانەی حەقیقەتەکانی ژیانی ئەمڕۆیە بەشێوەی تایبەتی ئەمڕۆی، بەڵام دەربارەی شیعری خۆم، ئەگەر ئێوە پێتان وایە مەسەلەی فۆرم لە شیعری مندا حەل بووە یان جۆرە هاوئاهەنگییەك لە نێوان بەشەکانی شیعری مندا هاتۆتە ئاراوە، پێموایە ئەمە ئەنجامی جۆرە هەڵبژاردنێکە — هەڵبژاردن بە شێوەیەکی گشتی نەك تەنیا لە ساتە وەختی داهێناندا– من نازانم لە چ پایەیەکدام، ئەوەندە دەزانم تا ئێستا هەموو شتێك خۆ بە خۆ دروست دەبێو ئەم خۆ بە خۆ دروست بوونەش ئەنجامی گەیشتنە بە "خود" یا ئەنجامی "خود" ناسینە. ئێستاکێ سەلیقە، فیکر، هەستو بینین ژێراو ژێر، بەڵام بە شێوەیەکی بنجبڕانە ڕێنوێنیم دەکەن. شیعریش وەك بنیادەم دەبێ لە سەرەتادا پێبگاتو باڵق ببێو ئەوجا هەرچی بوێ بیکا. پاش ئەم قۆناغە هەق وایە شیعر بوترێ. بە هەرحاڵ دەبێ ئەم قۆناغە ببڕیو بگەیتە کەماڵ. نەك هەر لە بواری شیعردا، بەڵکو لە بواری ژیانی ئاسایی ڕۆژانەشدا.

خەوشی کاری من لەمەدایە کە هێشتا هەموو ئەو شتانەی کە دەمەوێ بیڵێم، ناتوانم بیڵێم. من تەمەڵم. زۆر تەمەڵم. هەمیشە لەلایەنە ئیجابییەکانی بوونی خۆم هەڵدێمو خۆم بەلایەنە سەلبییەکان دەسپێرم. بە هەرحاڵ ئەم حاڵەتانە ناتوانن لە شیعری شاعیردا بێ کاریگەری بن، کە دەڕوانمە کتێبی "تولدی دیگر" خەمبار دەبم. بەرهەمی چوار ساڵ ژیانەو کەچی زۆر کەمە. من تەرازووم بە دەستەوە نەگرتووەو شیعرەکانم کێشانە ناکەم، بەڵام چاوەڕوانی زیاترم لە خۆم. شەوان کە دەنووم لە خۆ دەپرسم ئەمڕو چیت کرد ؟

عەیبەکەی من لەمە دایە کە کارەکانم دەشیا زۆر چاکترو زیاتر بوونایە، بەڵام منی گەوج لە بری ئەوەی پەرەیان پێبدەم، پێشم لێگرتوون. بە تەمەڵیی خۆم، بە نا ئومێدیی زۆر فەیلەسووفانەو خەمساردی گەوجانە پێشم لێگرتوون. ئەم پرسیارەش کە لە کوێدا سەرکەوتووم ؟ نازانم. ناشمەوێ بزانم، چونکە دەبێ تێپەڕم، شیعر لە ڕەوتی خوێ نەکەوتووەو بەردەوامەو ناتوانێ لە قاڵبێکی جواندا قەتیس بمێنێ. بیری سەرکەوتن بنیادەم تەفرە دەدات. دووچاری خۆپەسندی و غرووری دەکاتو لە جێی خۆی دەیچەقێنێ، من دەمەوێ بژیمو شتی تازە فێر ببم، بەڵام پرسیاری دووەم کە لە کوێدا بەسەر سەردا کەوتووم؟. دەیزانم. من هەمیشە پتر باوەڕ بە دوا شیعری خۆم دەکەم. ئەو باوەڕکردنەش یەکجار تەمەن کورتە، زۆری پێناچێت لەبەر چاوم

دەکەویؚو سادەو ساکار دەنوێنێ. من چەندین مانگە لە کتێبی "تولدی دیگر" جودا بوومەتەوەو دابــڕاوم. لەگــەڵ ئەمەشــدا واهەســت دەکــەم دەشــێت لــە دوا شــیعری "تولــدی دیگــر"ەوە دەستپێبکەم... هەڵبەتە مەبەست لە جۆرە دەست پێکردنێکی فیکرییە... مەسەلەی زمان بە خۆی حەل دەبیؚ و زمان، وەزن لەگەڵ خۆیدا دێنێ. کرۆکی مەسەلەکە فیکرو ناوەڕۆکە... من هەست دەکەم دەتوانم:

"ئەو پەرییە غەمگینەی لە ئۆقیانووسێکدا دەژی دڵی لە بلوێرێکدا لێدەداو دەمرێ، سەر لە نوێ زیندوو دەبێتەوە". بکەم بە سەرەتایەك. پێموایە هەموو ئەوانەی لە بواری هونەردا کاردەکەن، یەکێك لە هاندەرانی کارکردنیان، جۆرە پێویستییەکی لاشعورییە بۆ روو بە ڕوو بوونەوەی مەرگ و نەمان، واتە هونەر جۆرە هەوڵدانێکە بۆ گەیشتن بە نەمریو مان. هونەرمەندان خەڵکانێکن کە ژیانیان پتر خۆشدەوێو جوانتر لێی تێدەگەن وەك چۆن لە مەرگ تێدەگەن. کاری هونەری جۆرە هەوڵو تەقەللایەکە بۆ نەمری بەخشین بە "خود"و رەفز کردنی مەعنای مەرگ. هەندی جار وا بیردەکەمەوە کە راستە مەرگیش یەکێکە لە یاساکانی سروشت، بەڵام بنیادەم تەنیا لە بەردەم ئەم یاسایەدا هەست بەبێ دەسەڵاتی و بچووکی دەکات. ئەم یاسایە مەسەلەیەکە هیچی لەگەڵ ناکرێ. تەنانەت ناکرێ هەوڵی لە نێوبردنیشی بدرێ، چونکە فایدەی نییە. ئەمە تەفسیرێکی گشتییەو رەنگە گەوجانەش بێ، بەڵام شیعر بۆ من وەك هاوڕێیەکە کە پێی دەگەم، دەتوانم بە ئاسانی و بێپەردە دەردی دڵی خۆمی بۆ هەڵبڕژێرم. جووتێکەو تەواوم دەکات. بێ شیعر تەواو نابم. شیعر بێئەوەی ئازارم بدات تێرم دەکات. تینوێتیم دەشکێنێو رازیم دەکات. هەندێ کەس کەموکورتییەکانی خۆیان لە ژیاندا بەوە پینە دەکەن کە پەنا دەبەنە بەر کەسانی دی، بەڵام هیچ کاتێ پینە ناکرێ. ئەگەر پینەکراباو کەموکوڕییەکانی سڕدرابانەوە، ئەوا ئەمە بۆ خۆی دەبوو بە گەورەترین شیعری دنیاو بوون — پێوەندیی دوو مرۆڤ هەرگیز کامل نابێ— کەس، کەسی تری پێ تەواو ناکرێ. بە هەرحاڵ هەندێکی تریش پەنا دەبەنە بەر ئەم جۆرە کارە هونەرییانە، واتە شتێك دەخوڵقێننو ئاوێتەی خەڵقەندەکەی خۆ دەبنو ئەو دەمە هەست بە جۆرە تەواویو ئاسوودەییەك دەکەن. شیعر بو من پەنجەرەیەکەو هەر کاتێ بەرەو رووی دەچم خۆ بە خۆ دەکرێتەوە. هەنگینێ من لە بەردەمیدا دادەنیشم، تەمەشا دەکەم. گۆرانی دەڵێم.هاوار دەکەم. دەگریم. لەگەڵ سێبەری درەختەکاندا تێکەڵ دەبمو دەزانم کە لەودیو پەنجەرەکەوە ئاسمانێك هەیەو کەسێك هەیە دەبیسێ. کەسێك کە لەوەیە دوو سەد ساڵ پاشتر بێ یان سێ سەد ساڵ پێشتر لەوێ بوو بێ. شیعر هۆیەکە بۆ بەرپاکردنی پێوەندی لەگەڵ گەردوونو بووندا. چاکییەکەی لەوەدایە کە مرۆڤ وەختێ شیعر دەڵێ، دەتوانێ بڵێ: منیش هەم. یان منیش هەبووم. لەم حاڵەتە بترازێ ئیدی چۆن دەشێت بوترێ کە: منیش هەم یان منیش هەبووم.

من لە شیعری خۆمدا بە دووی چ شتێکدا ناگەڕێم، بەڵکو لە شیعری خۆمدا، خۆم دەدۆزمەوە، بەڵام لەشیعری کەسانی دیدا، یان لە شیعردا بە شێوەیەکی گشتی... دەزانی هەندێ شیعر هەن وەك دەرگای کراوەن نە لەم دیویان چ شتێك هەیەو نە لەو دیویان – دەبێ بڵێی حەیف بۆ کاغەزەکە. بە هەرحاڵ هەندێ شیعریش وەك دەرگای داخراون، کاتێ دەیانکەیتەوە هەست بە

هەڵخەڵەتاوی خۆت دەکەی و بایەخی کردنەوەکەیان نەبووە، بەڵام هەندێ شیعر هەن کە لە بنەڕەتدا دەرگا نین... جادەن، ئیدی کورت یان درێژ، گرینگ نییە، جادەن و بنیادەم پێیاندا دێ و دەڕوات و ماندوو نابێ. ئەگەر هەڵوەستەیەك بکا ئەوا بۆ دیتنی شتێکە کە لە هاتووچۆکەیدا نەی دیتووە... مرۆڤ دەتوانێ ساڵانێك لە نێو یەك شیعردا بوەستێ و هەموو جارێ شتێکی تازە بدینێ. لەو بابەتە شیعرانەدا ئاسۆ هەیە، ئاسمان هەیە. جوانی هەیە. تەبیعەت هەیە. ئینسان هەیە. ژیان هەیەو جۆرە ئاوێتە بوونێکی راستگۆیانە لەگەڵ هەموو ئەو شتانەدا هەیە، جۆرە نیگایەکی ئاگایانەو زانایانە هەیە. من ئەم جۆرە شیعرانەم حەزلێیەو بە شیعریان دەزانم. دەمەوێ شیعر دەستم بگرێ و لەگەڵ خۆیم بەرێ. من پێموایە کاری هونەری دەبێ بە هۆشیارییەوە پەیوەست بێ– هوشیاری سەبارەت بە ژیان، بە بوون، بەلەش و بەدەن و تەنانەت دەربارەی ئەو سێوەش کە دەیخۆین. ناکرێ ژیان بە شێوەیەکی غەریزی ببرێتە سەر، واتە هونەرمەندێك نابێ بەو جۆرە بژی. بنیادەم دەبێ سەبارەت بە خۆی و دنیای خۆی بۆچوونێکی هەبێ و هەر ئەمەش مرۆڤ ناچاری بیرکردنەوە دەکات. کاتێ بیرو بیرکردنەوە دەستی پێکرد ئیدی مرۆڤ دەتوانێ مەحکەمتر لەجێی خۆی بوەستێ. من ناڵێم شیعر دەبێ شیعری فیکری بێ، چونکە ئەمە قسەیەکی گەوجانەیە. من دەڵێم شیعریش وەك هەر کارێکی هونەری دی دەبێ زادەو ئەنجامی ئەو هەست و دیدو بۆچوونانە بێ کە لەلایەن فیکرەوە پەروەردەو رێبەری کراون. کە شاعیرێك،شاعیرو هوشیار بێ، ئەو کاتە دەزانێ چۆن بیرکردنەوەی دزە دەکاتە نێو شیعرەکانییەوە: لە شێوەی "شەمشەکوێرەیەك کە دێتە پشتی پەنجەرەیەکەوە" لە شێوەی "کلاوکوڕەیەکی مردارەوە بووی سەر بەردێك". لە شێوەی "کیسەڵێکی نووستووی بەر هەتاودا" و بە هەمان سادەیی و جوانی دزە دەکاتە نێو شیعرەکانی.

شیعر جۆری جیاوازی هەیە. هەندێجار شیعر تەنیا شیعرە. مەبەستم لە وشەی شیعر لێرەدا ئەو چەمکە لە سەدا سەد حسییەیە کە لە شیعردا هەیە. بۆ وێنە لە کاتی بولێڵی ئێوارێدا دەڕوانینە درەختێك و دەڵێین: چەند شاعیرانەیە... هەندێ شیعر بەو جۆرەن. واتا جوانن. بە هەرحاڵ هەندێ شیعریش "شاعیرانەن". هەڵبەتە ئەمانە شیعرن، بەڵام شیعر لەو کەوشەنەدا قەتیس نامێنێ و ئەمە ئاقاری تەواوەتی شیعر نییە. ئەمانە شوێنی خۆیان هەیە. شیعر شتێکە کە فاکتەری ناسکی و جوانیش بەشێکن لە بەشەکانی. بۆ وێنە یەکێك کە دەڵێ من کاتێ شیعر دەخوێنمەوە هەندێجار لەزەتی لێدەبینم، ئەدی پاش لەزەت دیتنەکە؟ ئایا ئەرکی هونەر تەنیا لەزەت بەخشینە ؟ ئەگەر وابێ ئەوا ئەم جۆرە کارە زیاتر حاڵەت دروست کردنە تا داهێنان و ئەفراندن.

من وا تێدەگەم ئەوەی کە شیعری ئێمەی شێواندووە، پتر رووکردنە ناسکی و جوانییە. ژیانی ئێمە جیاوازە. سەخت و دژوارە. کێوی و پەروەردە نەکراوە. دەبێ ئەم حاڵەتانە لە شیعردا رەنگ بدەنەوە، شیعری ئێمە پێویستی بە جۆرە خشوونەتێك و گەلێك وشەی نا شاعیرانەیە. تا گیانی وەبەر بکەوێتەوەو سەر لە نوێ زیندوو ببێتەوە. من لەم هەلومەرجەدا بە گۆشەگیری و رامان قاییل نیم. من دەڵێم دنیای موجەڕەدی مرۆڤ دەبێ زادەی گەڕان و تەمەشا کردن و تێکەڵبوونی

هەمیشەیی بە دنیای دەرەوە بیٚ. مرۆڤ دەبیٚ تەمەشا بکات تا ببینیٚو بتوانیٚ هەڵبژێریٚ. کاتیٚ مرۆڤ دنیای خۆی لە نێو خەڵکیداو لە قووڵایی ژیاندا دۆزییەوە، ئەو کاتە دەتوانیٚ ئەبەدییەت لەگەڵ خۆی هەڵگریٚو لەو دنیا تایبەتییەوە پێوەندی بە دنیای دەرەوە بکات. کاتیٚ ئێوە دەچنە سەر جادە، واتە تێکەڵ بە خەڵکی دەبنو دەگەڕێنەوە بۆ ژوورەکانتان، هەندیٚ شتی سەر جادەکە لە هزرو بیرتان دەمێنیٚ کە پێوەندی بە بوونی شەخسیو دنیای شەخسی ئێوەوە هەیە، بەڵام ئەگەر خۆتان لە ژوورەوە زیندان بکەنو گۆشەگیر بنو تەنیا پشت بە بیرکردنەوە دەربارەی جادە ببەستن، ئەو کاتە رەنگە بیرکردنەوەی ئێوەو واقیعەکەی سەر جادەکە زۆر لێکدی دوور بن. رەنگە لە جادەکەدا هەتاو بیٚو تۆ وا بیر بکەیەوە کە هێشتا تاریکە. رەنگە ئاشتی بیٚو ئێوە وا بزانن کە هێشتا شەڕە. ئەم حاڵەتە جۆرە گۆشەگیرییەکی سەلبییە. نە مرۆڤەکە رزگار دەکاتو نە زەمینەی داهێنانو ئەفراندن خۆشدەکات. بە هەرحاڵ شیعر لە ژیانەوە پەیدا دەبیٚو ئەمە حەقیقەتێکە نە نکوڵی لێدەکریٚو نە رەفز دەکریٚ، بۆیە دەبیٚ بە ناو ژیان بکەویٚو تەنانەت ناشیرینترینو بە ئازارترین ساتەکانی ژیان بجەڕبێنیٚ. هەڵبەتە نەك وەك منداڵێکی واق وڕماو، بەڵکو بە هوشیاری تەواوەوە. هەموو هونەرمەندێك دەبیٚ تێکەڵ بە ژیان بیٚ دەنا لە غەیری ئەم حاڵەتەدا پڕ نابیٚ!.

من دەربارەی شیعر هەمیشە وتوومە شیعر لە هەموو شتێکدا هەیە، بەڵام دەبیٚ بیدۆزیتەوەو هەستی پێبکەی، واتە شیعر سنووردار نییە، لە مەدارێکی تەسکدا ناخولێتەوە، بەڵکو گەردونگیرە. ئەگەر سەیرێکی ئەو هەموو دیوانە بکەی کە هەمانن، دەبینی بابەتی شیعرەکانمان یەکجار سنووردارەو لە مەدارێکی زۆر تەنگدا دەخولێتەوە. یان باس باسی مەعنەوییەتێکی هێندە بەرزە لە ئینسانییەت دەرچووە یا پەندو ئامۆژگاریو لاوانەوەو گاڵتەجاڕییە. زمانیش، تایبەتیی و نەگۆڕە، باشە چی بکەی؟!.

دنیای ئێمە دنیایەکی دییە، من کاتیٚ دەمەویٚ باسی کۆلانێکی پیسی یەکپارچە بۆگەنە میزو پیسایی بکەمو بێم لیستی عەترەکان لەبەردەم خۆدا ڕیز بکەمو بە بۆنترینیان بۆ وەسف کردن هەڵبژێرم، ئەمە تەڵەکەبازییە، فێڵێکە بنیادەم لە پێشدا لە خۆی دەکات، پاشان لە خەڵکی دی. من شیعر لە ڕێگەی خوێندنەوەی کتێبانەوە فێر نەبووم. ئەگینا ئێستا قەسیدەم دەنووسی. هەروا کەوتمە ڕیٚ، وەك منداڵێك کە لە بێشەیەکدا گوم دەبێت شتێك بەلای خۆیدا ڕایکێشام. تا سەرەنجام گەییمە سەرچاوەیەكو، لە ناو ئەو سەرچاوەیەدا خۆم دۆزییەوە. خۆمێك کە بریتییە لە خودی خۆمو تێکڕای ئەزموونەکانی ئەو بێشەیە.

کەواتە شیعر بۆ من مەسەلەیەکی جدییە. لێپرسراوێتیەکە کە بەرانبەر بە بوونی خۆم هەستی پێدەکەم، جۆرە وەڵامێکی ژیانی خۆمن. دەروێشێك یان سۆفییەك چەند ڕێزی پیرو تەریقەتی خۆی دەگریٚ، بە هەمان ئەندازە ڕێزی شیعر دەگرم. پێموایە ناشێت تەنیا پشت بە بەهرەو توانا ببەستریٚ، چونکە نووسین یان وتنی شیعرێکی چاك بە ئەندازەی کەشفێکی عیلمی، دیقەتو وردەکاریو زەحمەتی دەویٚ. باوەڕم بە شتێکی دیش هەیە. ئەویش "شاعیربوونە" لە هەموو ساتەکانی ژیاندا. "شاعیربوون" واتە ئینسان بوونو بوونە ئینسان. هەندیٚ کەس دەناسم کە ڕەفتاری ڕۆژانەیان چ پێوەندییەکی بە شیعرەکانیانەوە نییە. واتە تەنیا وەختی شیعروتن

شاعیرن‌و پاشان له شاعیری ده‌که‌ون‌و ده‌بنه‌وه به مرۆڤێكی حه‌سوودی به‌غیلی زاڵمی ته‌سكبینی بچكۆله. من قسه‌ی ئه‌و مرۆڤانه‌شم قبووڵ نییه. من زیاتر بایه‌خ به ژیان ده‌ده‌م، كاتێ ئه‌و بابه‌ته مرۆڤانه له شیعره‌كانیاندا یان له وتاره‌كانیاندا شۆڕشگێڕییان لێده‌تكێ‌و پڕ به‌زار ده‌نه‌ڕێنن، من دڵم لێیان تێكهه‌ڵدێ‌و باوه‌ڕناكه‌م راستگۆ بن‌و له دڵی خۆدا ده‌ڵێم ره‌نگه له پێناوی قاپێك پلاودا ئه‌م هاتوهاواره بكه‌ن. پێموایه كه‌سێك كه كاری هونه‌ری ده‌كات ده‌بێ هه‌وه‌ڵجار خۆی دروست بكات‌و كه‌ماڵ به‌خۆی ببه‌خشێت. پاش خۆی ئه‌وجا بێته ده‌رێ‌و وه‌ك یه‌كێك له‌م بوونه بڕوانێته خۆی تا بتوانێ حاڵه‌تێكی گشتی به‌سه‌ر له‌به‌ری مامه‌ڵه‌و بیرو هه‌سته‌كانی ببه‌خشێت..

سه‌رچاوه:
پێشه‌كی "برگزیده اشعار فروغ فروخ زاد"

چواره‌م: پێنج سه‌رنج ده‌رباره‌ی ( له دایكبوونێكی تر)

"١"

خا فروغ له سێ دیوانی یه‌كه‌میدا، واته "ئه‌سیر، دیوار، یاخی بوون" پتر هه‌واو هه‌وه‌سی ژنانه ده‌خاته قاڵبی نه‌زم‌و وه‌زنه‌وه. به‌ڵام كه ده‌گاته "له دایكبوونێكی تر" ئیدی فروغه‌كه‌ی جاران نییه، ده‌ستبه‌رداری هه‌واو هه‌وه‌سی ژنانه ده‌بێ‌و روو ده‌كاته وێنه‌گرتنی ژنانه، وێنه‌گرتنی ژنانه‌ی ژیانی تایبه‌تی خۆی‌و بارودۆخی ژینگه‌ی كۆمه‌لایه‌تی ژن. دیاره ئه‌م وێنانه كه له گه‌له‌ك

بواردا تازەو قووڵو زۆر پاكو خاوێنن، گەواهی شاعیرێتییەكی بێ وێنەی بۆ دەدەن. هەڵبەتە بێ وێنە لە شیعری فارسیدا.

"لە دایك بوونێكی تر" كە لە ناڤینی تەمەنی شاعیردا هاتە بڵاوبوونەوە، لە ڕاستیدا یەكەمین لە دایك بوونە نەك "لە دایكبوونێكی تر". جەوهەری شیعری لە دیوانەكانی پێشویدا یەكجار كەم بوو، فروغ وەكو شاعیر لەگەڵ بڵاوبوونەوەی "لە دایك بوونێكی تر"دا لە دایك بوو.

فروغ، لەم دیوانەیدا. بە پێچەوانەی دیوانەكانی دیكەی، كەمتر پەنا دەباتە بەرسۆز، بەڵكو پتر خۆیو شتەكانیو كۆمەڵگەو ژینگەی كۆمەڵایەتی لە مەیدانی شیعردا دەجەڕبێنێو هەست پێدەكا. چونكە دەزانێ شیعر ئەوە نییە كە دەربارەی شتەكانو كۆمەڵگە سۆزفرۆشی بكەی، بەڵكو شیعر هەستكردنە بە بوونی خەڵكو شتەكان. شاعیر دڵسۆزانە، دڵسۆز وەكو كاشیفەیەك بە نێو شتەكانا دێو دەچێ، شاعیر پردێكە لە نێوان ئێمەو شتەكانی دەوروبەری. فروغ، وەكو نیماو شاملوو رووی دەمی شیعری لە شاعیرە، پاشان روو دەكاتە ئەوانەی كە خاوەنی زهنی شاعیرانەن.

فروغ، هەرگیز نایەت پێشەكی بهۆنێتەوەو، بە دەگمەن خۆی بە ئەنجامگیرییەوە مژول دەكات ئەمە خەمی ئەو نییە، لە ناوەندەوە دەست پێدەكاو هەر ناوەندیشەوە كۆتایی بە شیعرەكەیو هەموو شت دێنێ.

وێنەكانی فروغ نە هێندە سادەو ساكارو روونن كە گەوجانەو بێتام بێنە بەرچاو نە هێندەش ئاڵۆزو نادیارن ببنە مەتەڵو هەڵهێنانیان مەحاڵ بێ. وێنەكانی ئەو یان ئەزموونی عاتیفی ئەوتۆن كە تایبەتێتی ئەزموونی گشتی بگرنە خۆ، یان كۆمەڵێك ئەزموونی گشتین كە دەشێت ڕەنگدانەوەی خودی ئەو بن. وێنە ئاوێتەیەكی ئەندێشەو هەستو خەیاڵە لە چوارچێوەی شتەكاندا، ئەو شتانەی كە سەر بە زەمانو شوێنی جیاوازن، بەڵام بە هۆی وشەوە وەكو پۆلە ستێران. وەكو هێشوە ستێران یەكیان گرتووە. پڕكردنی شیعرێك لە هێشوە وێنەیەك، بە شێوەیەكی ئاگادارانە كارێكی زۆر هەڵەیە. گەر لە پشت پەردەی وێنەكانەوە مرۆڤی راستەقینە بەرچاو نەكەوێ، ئەو وێنانە چ بایەخێكیان نابێ. لە وێنەدا خەیاڵی شاعیر هەمە كارەیە، شیعرەكانی فروغ لەم رووەوە پڕن لە تایبەتمەندی شیعری.

گەر شێواز، شێوەی ڕەنگدانەوەی زهنیاتی شاعیر بێ لە ڕێگەی وشەوە ئەوا فروغ نە نیمایە، نە شاملووە نە شاعیرانی دیكەی هاوچەرخو ڕابوردووە. فروغ لە هەندێ شوێنی زۆر كەمدا نەبێ. بۆ وێنە لە دێرێكدا یا لە كۆپلەیەكدا، یان لە شیعرێكدا، ئەوا شێوازی تایبەتی خۆی هەیەو هەر ئەمەش كردوویەتی بە شاعیرێكی ڕەسەن.

فروغ، لەم دیوانەیدا، دەستبەرداری ڕۆمانتیزمی سێ دیوانەكەی پێشووی بووەو ڕووی كردۆتە لیریزمی دەوڵەمەند.

فروغ له دیوانی "له دایکبوونێکی تر"دا هەرچی تەجرەبەی تایبەتی هەیە، واتا وەکو تاکێك ئەزموونی خۆی لەمەڕ ژیانو ژینگەو تەبیعەت هەڵڕشتۆتە داوێنی وێنەی شیعرییەوە. ئەم تەجرەبانە هەندێجار پەیوەستن بە ڕابوردووی تا ڕادەیەك دوورەوە "واتا پەیوەستن بە سەردەمی منداڵییەوە"، فروغ تێکەڵی کردوون و کردوونی بە هەوێنی شیعرەکانی، یان پەیوەستن بە قۆناغی بەرەو بلوغ بوون کە خا فروغ وێنەی یەکجار روونو ئاشکرای دەربارەی ئەم قۆناغە بەرجەستە کردووە، یا پەیوەستن بە قۆناغی ئێستاوە، وەزعو حاڵی ئێستای خودی شاعیر، وەزعو حاڵی خەڵکەکەی دەورو بەریو پەیوەستن بە ژینگەی کۆمەڵایەتییەوە. هەندێجار هەرسێ قۆناغەکە ئاوێتەی یەکدی دەبنو جیهانبینی گشتی فروغ، بە شێوەیەکی چڕ دەبارەی ژیانو کۆمەڵگەو چارەنووس، ئەشق نیشان دەدا. نموونەی هەرە جوانی ئەم بابەتە شیعرەی، شیعری "له دایك بوونێکی تره"ــەو لێرەدا هەوڵ دەدەین لەم شیعرە بکۆڵینەوە.

"ماکس پیکارد"ی فەیلەسووفی ئەڵمانی لە کتێبی "جیهانی بێدەنگی"دا لە فەسڵی (شیعرو بێدەنگی)دا دەڵێ: "شیعر لە بازنەی بێدەنگی دەردەچێو بە هیوای بێدەنگییە. شیعریش وەکو مرۆڤ، لە بێدەنگییەکەوە بۆ بێدەنگییەکی دی سەفەر دەکا. شیعر جۆرە فڕینێکە، بەسەر لوتکەی بێدەنگیدا. شیعری گەورە جۆرە کاشییەکە کە بێدەنگی داپۆشیوە".

دیارە ئەمە بەو مانایە نییە کە لە شیعردا بێدەنگی لە زمان گرینگترە: "بەرزترینو بالاترین شت ئەو شتە نییە کە قابیلی دەربڕین نەبێ، وەك بڵێی شاعیر لەوە مەنگترو قووڵترە کە شیعرەکەی دەربڕێو نیشانی بدا. چونکە بەرهەمی شاعیر نوێنەری ڕاستەقینەی ئەو شتانەیە کە لە بوونی شاعیردا خۆیان مەڵاس داوە.... شاعیر هەر ئەو شتە نییە کە لە دەروونیا دەمێنێ قابیلی دەربڕین نییە – هیگل".

شاعیری گەورە، ناچێ فەزای نێوەڕۆکی شیعری خۆی هەر هەموو بە وشە پڕ بکاتەوە، بەڵکو شتێك بۆ شاعیرێکی دیو شاعیرێکی گەورەتر دەهێڵێتەوە تابتوانێ قسان بکات. رێی ئەوە دەدا کە شاعیرێکی دی بەشداری ناوەڕۆکەکەی ئەم بکا. ئەو بابەتە دەکا بە هی خۆی، مۆرکی خۆی پێوە دەنێ، بەڵام بە تەواوی بۆ خۆی ناپیارێزێ. چونکە شیعری چاك تایبەتێتی فڕینو بزاڤی تێدایەو دوورنییە لە هەر ساتێکا لە ئامێزی شاعیرێکی دیدا، یا شاعیرێکی گەورەی تردا بگیرسێتەوە.

هەندێ لە شیعرەکانی فروغ ئەم تایبەتیانەی تێدایە، وا هەست دەکرێ کە شیعرێکی دی، چاکترو گەورەتر، لە مەودای نێوان وشەکانیا لە باوەشی بێدەنگی وشەکانیا خۆی مەڵاس داوە:

هەموو بوونی من نیشانەی تاریکییە

تۆ لە خۆیدا دوبارە دەکاتەوە

بەرەو سپێدەی پشکووتنو خەملینی ئەبەدیت دەبا

من لەم نیشانەیەدا ئاهم بۆ تۆ هەڵکیشا، ئاه

من لەم نیشانەیەدا تۆم

موتوربەی درەختو ئاوو ئاگر کرد.

"ماکس پیکارد" له فەسڵی "شیعرو بێدەنگی" کتێبەکەی خۆیدا کە ئاماژە بۆ شیعری ئەمڕۆی ئەوروپا دەکا، دەڵێ: "شیعری ئەمڕۆ، لە بێدەنگی دابڕاوە. شیعری ئەمڕۆ لە وشەوە، لە هەموو وشەکانەوە هەڵدەقوڵێ، دیارە زۆربەی شتەکان بە وشە نەقڵ ناکرێن، واتا وشە توانای نەقڵ کردنی زۆربەی شتەکانی نییە. یان زۆربەی ئەو شتانەی کە لە ڕێگای وشەوە نەقڵ بێن، بوونیان نییە. چونکە وشە خۆی عەودالی شتێکە تا بە شێوەیەك بەرجەستەی بکا. شاعیری ڕاستەقینە لەدەست بەسەراگرتنی شتەکانەوە دەست پێدەکاو ئەوجا دەکەوێتە سۆراخی وشە تا شتەکانی پێ بەرجەستە بکا، نەك بەپێچەوانەوە".

فروغ، لە وشەوە دەست پێ ناکات، لە شتێکەوە دەست پێدەکاتو هەوڵدەدا شتەکان بە هۆی وشەکانی خۆیەوە دەربڕێ، شیعری فروغ لەو چەند دێڕەی سەرەوەدا، بزاڤێکە لە تاریکییەوە بەرەو روناکی و لەوێدا مەعشوقەکەی ئاوێتەی درەختو ئاوو ئاگر دەبێ.

فروغ، پاش ئەو چەند دێڕە، بەشێکی ئەزموونی ژیانی خۆی کە تەواو هاوئاهەنگە لەگەڵ ئیلهامی دێڕەکانی یەکەمی شیعرەکەیدا، ئاوێتەی شیعر دەکات، ژیانی ئەمڕۆو مرۆڤ و شتەکان دەبینێ، گەرچی بە وشەی سادە دەریان دەبڕێ "وشەکانیش لە تۆ وایە پۆلە پاسارییەکنو بە نێو چیمەنێك کەوتوونو بە جریوە جریوی ئارامەوە بۆ دان دەگەڕێن". بەڵام جیهانبینییەکی تایبەتی لە چوارچێوەی هەمان سادەییدا دەکەوێتە روو، "ئەم جیهانبینییە لەم هزرە دەچێت کە هەموو بوونەوەرێك، تەنانەت بوونەوەرێکی چکۆلەی وەکو پاساریش عەودالی دانەوێڵەیەکە کە لەسەر زەمیندا وەدەستی بێنێ تا نەمرێ". لە پشت پاسارییە ساکارەکانی وشەکانی فەروخزادەوە، جیهانبینییەکی تەنانەت دەتوانم بڵێم جیهانی بەرچاو دەکەوێ. سادەیی شیعری فروغ هەندێجار دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هیچ مەودایەك لە نێوان ئەزموونی ژیانی رۆژانەی ئێمەو ئەو شتەی کە ئەو بە شیعر دەری دەبڕێ نامێنێتەوە:

ژیان لەگینە
ئەو شەقامە درێژە بێ
کە گشت رۆژێ
ژنێك بەخۆو زەمیلەکەیەوە
پێیدا تێدەپەڕی
ژیان لەگینە
ئەو گوریسە بێ
کە پیاوێك خۆی بە درەختێکەوە
پێ هەڵدەواسێ
ژیان لەگینە
ئەو منداڵە بێ
کە لە قوتابخانە دەگەڕێتەوە.

فروغ، به وشەی "لەگینە" جیهانبینییەکی تایبەتی و ژنانە لەمەڕ ژیان نیشان دەدا. ڕۆحی "لە دایك بوونێکی تر" ئاشقانەیە. بەڵام هەر لە چوارچێوەی هەمان ئاشقێتی و ئاوێتەکردنی ئەزموونی ڕاستگۆیانەی چەندین قۆناغی ژیانەوە پاکیزەییەکی تەنیایی ژنانەش بەرچاو دەکەوێ، پاکیزەییەك کە لەوپەڕی سادەیی دایە، دوورە لە هەموو توندو تیژییەك:

لە ژوورێکا کە بە ئەنازەی تەنیاییەکە

دڵی ئەز

کە هێندەی ئەشقێکە

دەڕوانێتە هەنجەتە سادەکانی.

بەختەوەری خۆی.

فروغ، ئەم ڕوانینە "ڕوانین بۆ هەنجەتە سادەکانی بەختەوەری" دەکا بە کلیل و دەرگای باخی بیرەوەرییەکانی پێدەکاتەوە:

بەشی من گەشتێکی خەمینە،

لە باخی بیرەوەرییەکاندا.

فروغ، هەر لە ڕێگەی ئەم گەشتە خەمامێزەوە، سەردەمی منداڵی و گەورە بوون و سەرجەمی ژیانی خۆی دەدۆزێتەوە و تەنانەت بە شێوەی گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی و گەورەبوونی خۆی لە شێوەی ئومێد و ئارەزوویەکدا بە ئایندە بەرجەستە دەکات:

دەستەکانم لە باخچەدا دەڕوێنم

سەوز دەبم،

دەزانم، دەزانم، دەزانم

پەڕەسێلکەکان لەچاڵی قامکە مەرەکەباویەکانم دا

هێلکە دەکەن.

بەم جۆرە گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی، دەبێ بە هیواو ئومێد بۆ "لە دایك بوونێکی تر" و سەوز بوونەوە. وەك بڵێی فروغ لەم چەند دێڕەدا ئاگاداری لە دایك بوونەوەی پاش مەرگە. فروغ، لە چەند دێڕێکی پاش گەشتی باخی بیرەوەرییەکان. لە شێوەی کچۆڵەیەکدا بە دیاردەکەوێ- کچۆڵەیەك بەگوارەی گێلاسەوە-کچۆڵەیەك بە ئەنگوستیلەی ئەستێرەوە ڕوو دەکاتە ئەو کۆڵانانەی کە کوڕانی هەرزەکار چاوەڕوانی دەکەن. فەروخزاد تەنانەت هۆش و هەستی ئەم کوڕە هەرزەکارانەش دەربارەی خەندەو بزەی بێگەردو پاکی کچۆڵەکە دەزانێ و پاشان بە شێوەیەکی نا ئاگایی شوێن پێی هەمان جیهانبینی "لەگینە"ی خۆی لەمەڕ ژیان هەڵدەگرێ و بەمتمانەو باوەڕ بەخۆ بوونی ئەو کەسانەوە کە خاوەنی جیهانبینی جیهانین، داوەری دەربارەی ئەوانە دەکا کە دەژین و دەمرن، هەروەها داوەری دەربارەی ئەوانە دەکا کە لە مردندا زیندوێتی بە دەست دێنن:

سەفەری قەبارەیەك لە خەتی زەماندا

ئاوس کردنی خەتی وشکی زەمان

بە قەبارەیەك،

قەبارەیەك لە وێنەی ئاگایی

كە لە میوانداری ئاوێنەیەك دەگەڕێتەوە.

ڕۆژانە یادداشتەكانی "لیوناردۆ دافنشی" ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە كە ڕۆژێك لە ژوورە چكۆلەكەی خۆیدا میزڵدانی مەڕێكی، هێندە فوو داوە تا قەبارەی میزڵدانەكە هێندەی قەبارەی ژوورەكە گەورە بووە،و ئەوانەی لە ژوورەكەدا بوون ناچار ژوورەكەیان جێ هێشتووە.

لێكۆڵەرەوانی یادداشتەكانی دافنشی، ئەم كارەیان بە دەركەوتنی بلیمەتی بلیمەتان شوبهاندووە، واتا كەسێتی بلیمەتان، هێندە هێزو توانا و شكۆ پەیدا دەكا كە قەبارەیەكی گەورەتر لە قەبارەی ئاسایی وەردەگرن یان كارێك ئەنجام دەدەن كە لە مێژوودا، ناویان بە گەورەیی و زیندوویێتی دەمێنێتەوە. بە گوتەی فروغ، خەتی وشكی زەمان بە قەبارەیەك ئاوس دەكەن و ئەم قەبارەیە بریتییە لە "وێنە گرتنێكی ئاگایانە" واتا قەبارەیەك كە شوێنی خۆی بە چاكی دەزانێ و ئەنجام ئەو قەبارەیەی كە خەتی وشكی زەمانی ئاوس كردبێ دەمێنێ. ئەو قەبارەیەی كە چ جێ پێیەكی لەسەر خەت و جادەی زەمان بەجێ نەهێشتبێ دەمرێ:

ئیدی ئاوایە

كە كەسێك دەمرێ و

كەسێكی دی دەمێنێ.

"٣"

شیعر، لە عومومیاتەوە دەست پێناكا. بەڵكو مامەڵە لەگەڵ جزئیاتدا دەكا. بەڵام لەوەیە پاش نیشاندان و بەرجەستە كردنی جزئیاتەكە بابەتێكی گشتی یان حەقیقەتێكی جیهانی بخاتە روو. باسكردنی مەرگ و جوانی و ئەشقی گشتی و عومومیات وێژی لەمەڕ مجەڕەدات و تەنانەت دەربارەی كۆمەڵگە و چارەنووسی بەشەرو تەبیعەت، كاری شاعیر نییە. شاعیر مامەڵە لەگەڵ جوزئیاتی مەرگ، ئەشق، جوانی و چارەنووسی بەشەردا دەكا، بەم مەعنایە كە بۆ وێنە لە مەرگی گشتییەوە، مەرگی تایبەتی، لە ئەشقی گشتییەوە، ئەشقی فەردی، لە جوانی گشتییەوە، جۆرە جوانییەكی فەردی و تایبەتی و لە چارەنووسی گشتییەوە، چارەنووسێكی تایبەتی بەرجەستە دەكا، دیارە تا ئەم تایبەتمەندیانە، توانای عومومیات گیری پتری تێدا بێ، ئەوەندە باشترو بەهێزتر دەبێ. فروغ، لە سێ دیوانەكەی پێشوتری خۆیدا لەمەڕ ئەشق، مەرگ و چارەنووسی بەشەرو خوا، عومومیات وێژی دەكرد، بەڵام لە زۆربەی شیعرەكانی "لە دایك بوونێكی تر" دا شەقڵێكی تەواو تایبەتی داونەتێ و لە راستیدا باسی ئەو ئەزموونە تایبەتیانە دەكا كە شەقڵی فەردییان وەرگرتووە، بەڵام لە چوارچێوەی گشتێتی هەمان ئەو ئەزموونانەدا دەگونجێ تەنانەت بە چەكی هەست و سۆز روو بە رووی فیكرە فەلسەفییەكان دەبێتەوە، بۆ وێنە بڕوانن بزانن چۆن ئەزموونی خۆی لەمەڕ مەسەلەیەكی وەكو ئاوس بوون، بە وردی دەخاتە روو و ئەزموونی خۆی رووبە رووی خەڵكان دەكاتەوە و بەو جۆرە شەقڵی گشتیان پێدەبەخشێ.

پەنام بدەن ئەی ژنانی سادەی كامڵ

پەنام بدەن ئەی ئەوانەی
لەو دیو پێستی سەر قامکی نەرمتانەوە
ڕەوتی جوڵەیەکی بەلەزەت
دوی سڵپاتێك دەکەوێ‌و
لە درزی بەرۆکتانەوە
هەمیشە هەوا ئاوێتەی
بۆنی شیری تازە دەبێ.

یان سەیربکەن. چۆن ئەزموونی هەستی مەرگ بە شێوەیەکی شەخسی‌و فەردی‌و بە هەموو نیشانەو هێمیایەکی ترسناکەوە بەرجەستە دەکا:

بە درێژایی ڕۆژ. بە درێژایی ڕۆژ
بەرەڵڵا، بەرەڵڵا، وەك جەستەیەکی سەرئاو کەوتوو
بەرەو سامناکترین تاوێر
قووڵترین ئەوشکەوتی دەریا
گۆشت خۆرترین ماسی
دەڕۆییشتم،
تەزووی مەرگی پێدا دەهات
یەکە بە یەکەی
مۆرەغەی ناسکی پشتم.

لە هەموو ئەمانە بالاتر ئەوەیە دەبینین چۆن هەستی خۆی لەمەڕ هاوباخەڵی، کە لە زۆر شیعریدا مامەڵەی لەگەڵ کردووەو بوون بە بەشێك لە تایبەتمەندییەکان‌و، جیهانبینی‌و تەجرەبەی شیعری ئەو بەرجەستە دەکات‌و چۆن بە شێوەیەکی ڕاستگۆیانەو تەنانەت ئارەزوو بزوێن،و بەسوود وەرگرتن لە هێماو خوازە وسیفاتی فەردی تایبەت بە ویساڵ، بە ریتم‌و ئاهەنگێکی لەبەردڵان، تەجرەبەی هاوباخەڵی بەرجەستە دەکات:

گوڵا سۆر،
گوڵا سۆر،
گوڵا سۆر،
ئەو، ئەزی بۆ باخی گوڵا سۆر بر
لە تاریکی دا گوڵێکی سوری لە
ئەگریجەی پەشێوم داو
سەرەنجام
لەسەر پەڕەی گوڵێکی سورا
لەگەڵم خەوت

هەر شاعیرێك، جوزئیاتی تایبەتی بۆ دەربڕینی مەبەستو ناوەڕۆكو یان حاڵەتی شتەكانی خۆی هەڵدەبژێرێ. رەنگە شاعیرێك لە ژینگەیەكدا شتێك یان چەند شتێك هەڵبژێرێ كە شاعیرێكی دی هەر بەلایدا نەچێ، یان لەوەیە شاعیرێك حاڵەتێك هەڵبژێرێ كە شاعیرێكی دی هەر هەستی پێ نەكرد بێ. فروغ لەم رووەوە شتی تایبەتی هەڵدەبژێرێ. شتگەلێك بە ڕواڵەت بێ بایەخ دەنوێنن، بەلاّم گەلەك مەعناو چەمكی گەورەو گشتییان لە پشتەوە هەیە. فروغ پاش ئەوەی هەندێ لە شتەكان لە گومناوی رزگار دەكا، مەعناو توانایەكی عاتیفی گەورەیان پێ دەبەشێت:

دەشێت سفر ئاسا
لە دابەشكردنو كۆكردنەوەو لێكدان دا
هەمیشە ئەنجامێكی یەكسانت هەبێ
دەشێت چاوانی تۆ
لەنێو پێڵوی تۆراویدا
مینا دوگمەی كاڵە وەبوی
پێلاّوێكی كۆن ببینرێ
دەشێت چەشنی ئاو
لەنێو گۆمی خۆیدا وشك ببێ

فروغ، هەندێجار لە شیعرێكی دا، شتێك یان حاڵەتێكی زۆر جوان لە پالْ شتێك یان حاڵەتێكی زۆر ناشیریندا دادەنێو یان دوو شتی تەواو دژ بەیەك لە رووی ماناوە پێكەوە دەچەسپێنێو- ئەم كارە زیاتر ئەلیوت خەریكی بووە- ئەنجامێكی عاتیفیو فەلسەفی یان رۆحی قوولْ وەردەگرێ:

دەشێ جوانی لە حزەیەك لەگەلْ شەرمدا
چەشنی وێنەیەكی پێكەنین هێنەری رەشو سپی فەوری
لە نێو سەندوقەكەیدا بشاردرێتەوە.
مەعشوقەكەی من
بە لەشی رووتی بێ شەرمییەوە
وەك مەرگ
بەسەر لاقە بەهێزەكانییەوە
وێستا.

فروغ، هەندێجار زۆر بەوردی حاڵەتە هەڵبژاردەكانی خۆی وەسف دەكاتو لەم وەسف كردنەیدا هەندێجار حاڵەتەكان لە خەمێكی تەم ئاسا دەگرێ. بۆ وێنە لەم كۆپلەیەدا، لە تۆ وایە فروغ. بێ جێو شوێنەو بە دوای خانوویەك دا دەگەڕێو بەم جۆرە خانووی ئارەزووو، دڵخوازی خۆیمان دەخاتە بەرچاو:

بیر لە خانوویەك دەكەمەوە

هەناسەی پێچكەكانی، تاقەتبەر نەبێ

چلچراكانی، رۆشن وەك بیلبیلەی چاو

شەوانی قووڵو مەنگ، سست، بێ سرتە بێ

بیر لە منداڵێ دەكەمەوە،

بزەی

وەك بازنەی یەك لە دوی یەكی

سەرئاو، بێ كۆتایی بێ

بیر لەتەنێ دەكەمەوە،

پڕ خوێن وەك هێشووی،

ترێ بێ.

پاش ئەمە، لە پڕ لە گفتوگۆیەكی زهنیدا، وەك بڵێی وەڵامی وەسفی خانووە دڵخوازەكەی بێ، زۆر بێڕەحمانە دەكەوێتە وەسفی خانووە حەقیقییەكەی:

من بیر لە وێرانە دەكەمەوە

لە تالاّنو بڕۆی ڕەشەبا

لە روناكی گومان لێكراو

كە شەوان لە پەنجەرەدا دەخزێ

بیر لە گۆڕێكی بچكۆلە دەكەمەوە.

بچوك وەك جەستەی نەوزادێك.

و هەندێ جار ئەم وەسفە، زۆر بە ڕاشكاویو سەرەڕۆیانە بەدیار دەكەوێو حەقیقەتێكی روناك، مرۆڤ بەرەو قولایی ترس دەبا:

هەمیشە لە ئاهەنگی ئیعدامدا

كاتێ پەتی سێدارە

چاوانی گرژی مەحكوومێك

لە كاسە دەردەپەڕێنێ

ئەوان دەچوونەوە قاوغی خۆو

تەسەورێكی شەهوەت بزوێن

تەزوی بە دەماری پیرو ماندویان

دەدا.

"٥"

مرۆڤ لە جادەیەكی پانەوە بە نێو شار دەكەوێ. بە چەندین مەیدانو دووڕیانو سێ ڕیاندا تێ دەپەڕێ. چەندین شەقامو كۆلاّن بەجێ دێڵێ. هەزاران خانوو ومالّ دەبینێو ئەنجام لەبەردەم

دەرگایەکدا دەوەستێ. بە کلیلێك دەرگا دەکاتەوەو دەچێتە ژوورەوە، ئیدی ئێرە شوێن و ماڵی ئەوەو چی دەکات و چی ناکات ئازادە.

تەکنیکی گشتی شیعر. هەمان جادەی پانە، شاعیر لەو جادەیەوە دەست پێدەکات، خۆی لە شاری تەکنیکی گشتی شیعردا دەبینێتەوە، بە پێچ و پەناکاندا ڕەت دەبێ و ئەنجام کلیلی تەکنیکی خۆی بە دەستەوە دەگرێ و دەرگای فۆرم دەکاتەوەو ئازادانە ڕەفتار دەکات.

لە بارەی فۆرمەوە. ئەگەر شاعیر پاش کۆمەڵێك ئەزموونی جیاواز خۆی نەدۆزێتەوەو پاش فێربوونی تەکنیکی خەڵکان و ئەزموونی هاوبەش لەگەڵ هەموو شاعیراندا، تەکنیك و فۆرمی تایبەتی خۆی پەیدا نەکا، واتا ئەگەر شاعیر سات بە سات ئەو جادە پانە تەسك نەکاتەوە، هەرگیز نابێ بە خاوەنی شێوازی تایبەتی خۆی. شاعیر هێندە بەرز دەبێتەوە کە لە ئەنجامدا تەکنیکی کارەکەی شێوەی تیغێك وەردەگرێ. تیغێکی دیار، بڕندە، درەوشاوە کە لە پڕ ئینسان لە تیژی و بڕندەییەکەی ئاگادار دەکاتەوە. تەکنیکی شاعیر لە ئەنجامی مەشق و مومارەسەو تاقیکردنەوەوە دەبێ بە شتێك لە موو باریکترو لە پەڕەی گوڵ ناسکتر. شاعیر وەکو تەنافبازێکە کە بەلێهاتووی لە ئاسماندا و بەسەر تەنافێکی باریکدا دێ و دەچێ و سەما دەکات، هاتووچۆ وسەمایەك کە لەسەر زەمینی پان و بەرین نایەتەکرن.

شاعیر، بابەت و ناوەڕۆکی خۆی هێند بەرز دەکاتەوە تا دەیگەیەنێتە ئەو پەتە لە موو باریکترو ئەو تیغە بڕەندەیە. واتا بە هەمان شێوە کە تەنها دروستکاران و ڕاستگۆیان دەتوانن لە پردی سیرات بپەڕنەوە. ئەوانەی کە ڕاستگۆیانەو دڵسۆزانە کەوتونەتە عەوداڵی فۆرم و تەکنیکی تایبەتی و فەردی، دەتوانن لێهاتووانە لەسەر لێواری ئەو تیغە بڕندەیە بڕەقسن و ئەو پەڕی توانا و دەسەلات بنوێنن.

بۆ وەدەست هێنان و دۆزینەوەی تەکنیکی شەخسی و تایبەتی دەبێ لە خۆت دوور بکەوێتەوەو لە زمان نزیك ببیتەوەو دەبێ تەکنیکی جۆراو جۆر تاوتوێ بکەوی. دەبێ خۆت بخەیتە شوێنی شاعیرانی ترو شتیان لێوە فێر ببی و لاسایی فۆرمی ئەوان بکەیتەوەو پاشان لە چوار چێوەی زماندا تاقی بکەیتەوە، لە زمانێکی گشتییەوە کە هەمان جادەی پانی دەرێی شارە دەست پێبکەی و بچێتە شاری زمانەوە، زمانی تایبەتی شاعیرانەی خۆت بدۆزیتەوە. ئەو کەسانەی کە نەتوانن لە خۆ جیا ببنەوە، ناتوانن تەکنیکی بە هێز پەیدا بکەن. مەبەست لە "جیابونەوە لەخۆ" ئەوەنییە کە ئینسان هەموو شتێکی خۆی وەلا بخا، بەڵکو مەبەست ئەوەیە هێندە لە زمانی کۆمەڵگەی خۆیدا نقوم ببێ، هەرکە بەرەو خۆی گەڕایەوە، زمانی تایبەتی خۆی دۆزی بێتەوە.

ئەو شاعیرەی کە جیهانبینی تایبەتی خۆی هەبێ. هەرکە گەییە ئەم حاڵەتە تەکنیکییە، ئیدی بابەت و ناوەڕۆك بە ئاسانی بەرەو پیری دێن. چونکە هەر کاتێ بە تەکنیکی بە هێزەوە روو لە هەر ناوەڕۆکێك بکات، شتێکی جوان و بێ وێنەی لێ دروست دەکات. شێواز بریتییە لە سەمایەکی تەکنیکی تایبەتی لە بەرانبەر ناوەڕۆکێکی گشتی. ناوەڕۆك لە ئەزەلەوە هەبووەو هەیە، بەڵام تەکنیك بەپێی قەریحەی زاتی شتێکە تاڕادەیەك موکتەسەب. بۆیە دەڵێم بەپێی قەریحەی زاتی،

چونکە ئەگەر قەریحە نەبێ، چ شتێك کەسب ناکرێ، چ شتێك کەسب ناکرێ، لەگەڵ ئەمەشدا مەکسیم گۆرکی گوتەنی "بەهرە، یەعنی کار". کەسێك کارنەکات بەهرەو توانای بەدیار ناکەوێ، واتا زۆر نووسین‌و زۆرگوتن‌و هەمیشە لە حاڵی تاقیکردنەوەدا بوون‌و هەڵبژاردن لە و گوتن‌و نوسین‌و تاقیکردنەوانە.

فروغ، بە تەکنیکێکی بە هێزەوە، شێوازی خۆی دۆزیوەتەوەو لەم کارەدا بەهرەو توانای خۆی نیشانداوە. لە مهدی حمیدیيەوە تا احمد شاملوو گەرچی لە رووی زەمانەوە چ جیاوازیو دووریيەك نییە، بەڵام لە رووی شیعرییەوە بەلای کەمەوە نیو سەدەیەکیان فەرقە. فەروخزاد ئەم مەودای ئەم نیو سەدەیەی بە کەمتر لە دە ساڵ بڕیو لەم ماوەیەدا، ئاشنایەتی لەگەڵ "توللی"و "مشیری"و "نادر پور"دا پەیدا کرد. ئەوانی بەجێ هێشتو کەوتە شان بە شانی "شاملو"، بەڵام لە شێوەیەکی ژنانەدا... ئەوجا قەدەرێ لە نیماو شیعری نیمادا ڕاماو بوو بە هاونشینی ئەو شاعیرانەی کەوتبوونە ژێر کاریگەری نیماوە. ئەوجا رووی کردە زمانێکی راستگۆیانە، وەزنی لە تەبیعەتی قسەکردن نزیکتر کردەوەو جۆرە وەزنێکی ئاسایی ژنانەی داهێنا کە تەنیا لە ڕیشەدا دەچێتەوە سەر وەزنی عەروزی فارسی. پاشان هەستی بە گیانی ڕەنگین‌و ئازادو پڕ گۆڕانی زمان کرد. فروغ، هێندە بە قوڵی تەکنیکە نوێیەکەی خۆی لە هزری خوێنەردا چەسپاندووە، ئەگەر شیعرێکی ئەو بەبێ ناوی خویشی بڵاوبێتەوە، ڕەخنەگری شیعری هاوچەرخ دەتوانێ بیناسێتەوە. شێواز بەلای ڕەخنەگرەوە ئەو فاکتەرەیە کە بە هۆیەوە شیعری شاعرێکی خاوەن شێواز بناسرێتەوە. شیعری فروغ بە خوازەکانیا، بە جۆری مامەڵەی لەگەڵ وشەدا، بە جۆری بزاڤی وێنەکانیاو بە تایبەتمەندی ئەو فرمانانەی ئەو بەکاریان دێنێ بە ئاسانی دەناسرێتەوە.

فروغ، لە نێوەڕۆك‌و بابەتی شاعیرانی جۆراو جۆرو سوود وەردەگرێ، بەدێر لە نیما وەردەگرێ، خەونەکانی شاملو دەقۆزێتەوەو مامەڵەیەکی فروغانەی لەگەڵ دەکاتو ئەمە قووڵی بە شیعرەکانی دەبەخشێ‌و هەرگیز لە ڕەسەنایەتی فروغ وەکو شاعیرێك کەم ناکاتەوە.

<u>تێبینی</u>: ئەم نووسینە لە کتێبی "طلادرمس"ەوە کراوە بە کوردی/طلا در مس/رضا براهنی/ کتاب زمان/چاپ دوم/١

## پێنجەم:باڵندە مردەنیە، بەڵام فڕین هەر دەمێنێ
## فروغ لە تای تەرازووی شیعردا

هەڵبەتە گومان لەوەدا نییە کە هەڵسەنگاندنی کۆی شیعری هەر شاعیرێك، بە تایبەتی گەورە شاعیران، کارێکی ئاسان نییە، سەلیقەو شارەزاییو وریاییو ئینساف دەوێت‌و ئاستی شیعریی هیچ شاعیرێکێش لە هەوەڵەو تا کۆتایی چوونیەك نییە. بۆیە پێموایە زەرورەتی هەڵسەنگاندنی دروستی شیعری هەر شاعیرێکی مەزن، قۆناغبەندی ژیانی شیعری ئەو شاعیرە دەخوازێت. جا لەم پێودانگەوە دەکرێت ژیانی شیعریی فروغی فەڕوخزاد وەکو شاعیرێکی گەورەی سەدەی بیستەمی ئێران بکەین بە دوو قۆناغەوە. قۆناغی یەکەم کۆمەڵە شیعرێن: (اسیر، دیوار، عصیان)

له خۆ دەگرێت. قۆناغی دووەم هەردوو کۆمەڵە شیعری: (تولدی دیگر، و ایمان بیاوریم به اغاز فصل سرد) له خۆ دەگرێت.

دنیای شیعریی قۆناغی یەکەمی ژیانی شیعریی فروغ، بڕێك سنووردارە، زیاتر نوێنەری ژنێکه تەنیاو ناڕازی، دنیایەکه پڕ له پێڵو شەپۆلێن به گێژەنگو گێژاوی هەستێن ژنانەو دایکانەی دژ به دابو نەریتو خووخدەی کۆنو باوی خانەوادەیی، نێوەڕۆکی ئەم شیعرانه تا رادەیەك سەتحییەو بێ هیچ هەڵوەستەو قووڵبونەوەیەك به ئاسۆیی دەڕوات. بەڵام دنیای قۆناغی دووەم دنیایەکه بێ سنوور، کراوە تا ئەوپەڕی کرانەوە، راسته نوێنەری ژنێکی تەنیایە، بەڵام به کەڵکەڵەو خەونو خەیاڵو بیرو هزرینێکی جیهانی، له چوارچێوەی شیعرێن ئازادو به ناوەڕۆکێکی قووڵو ئەستوونی پڕ جوڵە، پڕ له هەڵوەستەو قۆناغو قووڵبوونەوەی زۆر، که خوێنەر به هەردوو باری ئاسۆیی و ئەستوونیدا دەگەڵ خۆیدا دەبات. هەموو شیعرەکانی قۆناغی یەکەم له نێوان ساڵانی ١٣٣٢– ١٣٣٩دا نووسراونو شیعرەکانی قۆناغی دووەم له نێوان ساڵانی ٣٣٩– ٣٤٥دا نووسراون. هەر قۆناغێك کۆمەڵێك وشەی کۆد ئاسای خۆی هەیه که دەشێت وەکو کلیلی کردنەوەی دەرگای شیعرەکان بەکار ببرێت، دیاره ئەم وشانە، له هەردوو قۆناغەکەدا چوونیەك نینو، واته گۆڕانی تەواویان بەسەردا هاتووەو دەکرێت له میانەی کۆدە وشەکانەوە، جیاوازی دنیای بچووکی قۆناغی یەکەمو دنیای گەورەی قۆناغی دووەمی شیعری ئەو بناسیت.

هەڵبەته فروغ. دوای ئەوەی ئاشنایەتی دەگەڵ شیعری شاملو و نیمادا پەیدا دەکات، زەینی شاعیرانەی وی بەرەبەره دەخەملێو به کوچەو کۆڵانانی تەجریبی شاعیرانەی خۆدا دێتو دەکەوێته خەمی ئەوەی که دەنگو ڕەنگی خۆی هەبێت، دیدو هەڵبژاردنی خۆی بدۆزێتەوە، خاوەنی نیگای بینابێ، خودانی گوێی شەنەوا بێ.... دەگاته ئەو قەناعەتەی که کاری هونەری تەنیا به دەربڕینی هەسته غەریزیو سروشتیەکان پێك نایەت. هونەرمەند وەختێ هونەرمەندە که جیهانبینیو نۆڕینی خۆی سەبارەت به خۆیو به جیهان هەبێتو بەره بەره ئەم نۆڕینو جیهانبینیو هزرینه له بەرهەمەکانی خۆیدا هونەریانه بنوێنێ.

هەڵبەته پێویسته لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت که فروغ له هەوەڵی کاری هونەریەوە له باری فیکریو نێوەڕۆك و له رووی وێنەو خەیاڵی شیعرییەوە سیمای تایبەتی خۆی هەبووەو، سێبەری لاسایی کردنەوەی شاعیرانی دی بەسەر شیعرەکانیەوە بەدی ناکرێت... ئەوەی له قۆناغی یەکەمی شیعریی ئەودا مایەی سەرنجەو تازەیە، لایەنی هونەرمەندانەی ئیعترافاتی بابایەکی شاعیری ژنه که بوێرانەو راستگۆیانه هەستەکانی خۆی دەربڕیوە، واته ژنێك بوو که دژایەتی خۆی بۆ دابو نەریتی باو نەدەشاردەوە، بەڵام ئەم کارەی تەنیا له دەوری تەوەری "من"ی تایبەت به خۆی دەسوڕایەوە. ئەو "من"ـه فەردیەی که له زۆربەی شیعرەکانیا ڕەنگی داوەتەوە،و شیعرەکانی له سنووری پیشاندانو نواندنو ناساندنی ئەم "منایەتیە" هێوەتر نه دەڕۆیین. ئەو منه فەردی و شەخسیو ئێرانیەی که پاشان له قۆناغی دووەمی شاعیریەتی ئەودا پەرەی سەندو گۆڕاو بوو به منێکی جڤاکیو گشتیو جیهانی. واته مەداره تەنگەکەی منایەیەتیەکەی جارانی بەزاند... هەروەها له رووی وێنه سازی و داڕشتنی شیعریشەوە خودانی

خەیاڵێکی هەندێ تایبەتو جیاواز بوو، زۆربەی وێنەو دارشتنەکانی تازەنو زادەی زەینی داهێنەرانەو دنیامیکی ئەون، ڕێگەی بە خۆی نەداوە، وێنەی شیعری خەڵکانی دیکە بە سووکە دەسکارییەوە دووبارە بکاتەوە. چونکە وەکو شاعیرانی دیکەی ئەو رۆژگارە نەك هەر لە دنیای دەریێی خۆی دانەبڕاوە، بەڵکو هەمیشە ئەم دنیایە لەگەڵ دنیای ناوەوەیدا لە کارلێکی بەردەوامدا بووەو بۆیە وێنە شیعریەکانی لە ناخی خۆیەوە هەڵدەهێنجاو لە شیعرا نمایشی دەکردن. ئەمەش زادەی ئەو واقیعە بوو کە خۆی گوتەنی نە ئەوەندە نقومی ئەدەبیاتی کلاسیکی بوو، لە پەلوپۆ بکەویو لێی دەرنەچێت، نە ئەوەندەش دڵبەندو گیرۆدەی داوی ئەدەبیاتی نوێی فەڕەنگی بوو کە تیایدا ون بێ. هەمیشە پشتی بە زەینی داهێنەرانەی خۆی بەستبوو، هەمیشە ئامادەو چاوەڕوانی ئەوە بوو شیعر لەودا حلول بکات، بە خۆی لەمبارەیەوە دەڵێت: "... لە دیوارو (هەڵبەتە لە ئەسیریش دا) من تەنیا گوزارشتگەرێکی دنیای دەرێی خۆم بووم. لەو زەمانەدا شیعر هێشتا لە منا حلولی نەکرد بوو. بەڵکو لە ماڵێکا پێکەوە بووین. وەکو مێردو وەکو ماشوق، وەکو هەموو ئەو خەڵکانەی کە چەند مودەتێك دەگەڵ بنیادەمدان. لێ پاشان شیعر لە مندا ریشەی داکوتاو لەبەر ئەمە بابەتی شیعر لەلام گۆڕاو ئیدی من شیعرم تەنیا بە دەربڕینی هەستێکی فەردیو تایبەت، سەبارەت بە خۆم نەدەزانی. کە شیعر زیاتر لە منا ریشاژۆ بوو، من پەراگەندەتر بوومو دنیایانی زیاترم کەشف کرد." گفتوگۆ دەگەڵ سەدرەدین ئیلاهی –مجلە سپیدو سیاه – اسفند/ ١٣٤٥.

ئیدی لێرەوە فروغ، بەدەم ژانی شیعرەوە، لە قۆناغی یەکەمی شیعریی خۆیەوە دەپەڕێتەوە بۆ قۆناغی دووەم، کە بە ڕاستی قۆناغی خەملێنی شیعری ئەوە بوو، وەکو شاعیرێکی گەورە لە هەردوو دیوانی: (تولدی دیگر و ایمان بیاوریم...) دا بانگەوازی (انا الشعر)ی بە گوێی جیهاندا دا.

دیوانی ئەسیر: یەکەمین کۆمەڵە شیعری فروغی فەڕوخزادە، کە شیعری ساڵانی ٣٣٢، ٣٣٣، ٣٣٤ی شاعیری لە خۆ گرتووە، واتە شیعری ١٩، ٢٠، ٢١ ساڵی تەمەنی شاعیرنو بیستو نۆ شیعرە. دیوار دووەمین کۆمەڵە شیعری (فروغی فەڕوخزادە) کە شیعرێن ساڵانی ٣٥و ٣٦و ٣٧ی لە خۆ گرتووە. هەندێ شیعری ئەم دیوانەش هەندێ شیعری نەبێ، دەنا بە هەمان نەفەسی دیوانی یەکەمەوە نووسراوە. ئەم دیوانە بیستو پێنج شیعری لە خۆ گرتووە. عوسیان (عصیان): سێیەمین کۆمەڵە شیعری فروغە کە بەرهەمی ساڵانی ٣٦و ٣٧ی شاعیری لە خۆ گرتووە. شاعیر لەم دیوانەدا، لەبەر رۆشنایی دەقێن کتێبانی پیرۆز، بە تایبەتی ئەو بەشانەی کە پەیوەندیان بە خەلیقەتی ئینسانو یاخی بوونی ئەهریمەنەوە هەیەو، پێش ئەویش زۆر شاعیرێن رۆژهەڵاتیو رۆژاوایی بایەخیان پێداوەو بە نەفەسی هزرینی خەیامانەوە لە دەربڕینی حاڵەتو هەستە غەریزیە ژنانەکانی خۆی دوور کەوتووەتەوە، بەڵام سەرەنجام کە هەموو پرسیارەکان بێ وەڵام دەمێننەوە، شاعیر ڕادەستی خودا دەبێتو داوای بوردنی لێدەکات بۆیە یەکێك لە کۆدە وشە زاڵەکانی ئەم دیوانە وشەی خودایە،و لەم چوار چێوەیەدایە کە بەرەبەرە بیری مەرگ شوێنی ئەشق دەگرێتەوەو کەم کەم خەمی مردن باڵ بەسەر روحی شاعیردا دەکێشێت. شیعرەکانی ئەم

دیوانەش وەکو هەردوو دیوانی (ئەسیرو دیوار) زیاتر بە زمانێکی راستەوخۆو لۆژیکی پەخشان ئامێزەو زیاتر لە هەمان قاڵبی ئەو دوو دیوانە دایە. ئەم دیوانە هەژدە شیعری لە خۆ گرتووە کە بە شیعری (زندگی = ژیان) کۆتایی هاتووە، کە پێدەچێ سەرەتاو دەرگەیەك بێت بۆ چوونە ناو هەوەڵین شیعرەکانی (تولدی دیگر).

(تولدی دیگر): چوارەمین کۆمەڵە شیعری شاعیرە، کە هۆزانێن ساڵانی ٣٨- ٤٢ی لە خۆ گرتووە. ئەو شیعرانەن کە زادەی دووەمین لە دایکبوونی ژنێکن کە ساڵی ١٣٣١، یەکەمین ساڵی لە دایکبوونی شاعیری ئەو بووە. ئەم دیوانە لە هەردوو دیدو ئاستی ناوەڕۆکەوە بە تەواوەتی لە سێ دیوانەکەی پێشووتری شاعیر جیاوازە، فروغ لە سێ کۆمەڵە شیعری یەکەمیا بێ ئەوەی کەمترین سوودی لە زمان و فەزای شیعری نیما دیتبێ، لە ساڵی ٣٢وە تا ٣٩ جگە لە دەربڕینی قسەێن ژنانەو پرسیارێن یاخیگەرانەی خۆی، پەلی بۆ هیچی تر نە هاویشتووە. تا لە نەورۆزی ساڵی ٤٢دا کە لە ناکاو درەوشانەوەی سیمای فروغێکی دی لە شیعری (اوهام بهاری = وهم سبز) لە (کتێبی هفتە) دا چاوانی سەرسام و ئەبڵەق کرد. لەو ساڵەدا بوو کە چاپکردنی (تولدی دیگر) بوو بە رووداوی شیعریی رۆژ. لەم دیوانەدا بوو کە فروغ کۆمەڵێك دەرگەی بەسەر دنیایانی دیدا کردەوەو لەو دیو ئەو دەرگانەوە کۆمەڵێك هەستی کەشف کرد کە هەرگیز لە چوار دیواری ژوروێن دەرگا داخراوی ماڵەوەدا، توانای دیتنی ئەو هەستانەی نەبوو. هەستگەلێکی لێورێژ لە ترسی زەواڵ و تەژی هەڵچوونی نیگەرانی و یاخی بوونی قووڵی ئینسانی شاعیرێك کە لە هەڕەمەی متمانە بەخۆییدا، زەڕەیەك متمانەی بە کۆمەڵگەی مرۆڤانی و جیهانی زەمانی خۆی نەما بوو.

زۆربەی شیعرەکانی ئەم دیوانە بە زمانێکی نزیك لە زمانی دیالۆگی و بە کێشێکی نزیك لە تەبیعەتی قسەکردن و بە جەوهەرو کرۆکێکی شیعری و کۆمەڵێك وێنەوە کە تا ئەو رۆژە لە زمانی هیچ شاعیرێکدا پێشینەی نەبووە، نیشان دراون. ئەم دیوانە سی و پێنج شیعری لە خۆ گرتووە کە گرنگترینیان شیعری (تولدی دیگر)ە. هەندێ لەم شیعرانە، لە جۆری خۆیاندا، تا ئێستاش بە باشترین و بەرزترین شیعری ئەمڕۆی فارسی دێنە ژماردن.

(ایمان بیاوریم بە اغاز فصل سرد): پێنجەمین و دوا دیوانی فروغە کە بەرهەمی سێ ساڵی کۆتایی تەمەنی ئەو، لە ساڵی ٤٢ـەوەوە تا ١٣٤٥ لە خۆ دەگرێت. ئەم دیوانە چ لە رووی شێوەو فۆرم و چ لە باری پوختەیی زمان و دەربڕین و هزرەوە لە سەرووی دیوانی (تولدی دیگر)ەوەیە. دیوانێکی حەوت شیعرییە، کە هەر شیعرێکیان ترۆپکی خەیاڵ و هزرینی شاعیر نیشان دەدات و پیاو وای لێدەکات کە لە خۆی بپرسێت کە ئەگەر فروغ بمایە، ئایا دەیتوانی لەم سنوورەدا هێوەتر ڕۆیشتبا. شاعیر لەم دیوانەدا زیاتر قسان لە شەو دەکات. لە تاریکی و ئەو جەنازە بەختەوەرانەی لەم دەڤەرە تاریکەدا، دێن و دەچن و شاعیر کە سێبەری ترسناك و بەزەیی وروژێنی ئەو دیمەنانە دەبینێ بە ناچاری پەنا بۆ خۆی دەبات و لەبەر پەنجەرە هەمیشەییەکەی خۆیدا، پەنجەرەی روو لە هەتاو، گۆشەگیری هەڵدەبژێرێ. بەڵام وەکو جاران ناتوانێ پەیوەندی دەگەڵ نوور، روناکیدا پەیدا بکات. چونکە هیچ کەسێك نییە ئەو بە هەتاو بناسێنێ و بەوە دڵخۆشی

خۆی دەداتەوە کە ناوی فریارەسەکەی، رزگارەکەرەکەی لە ئاوێنە بپرسێت. زمانی فروغ، لەم دیوانەشدا، هەمان زمانی دیالۆگیو مەردمییە کە لە چوارچێوەی دەربڕینی پێشکەوتوانەو زمانی شیعری تایبەتی ئەودا، شکۆو جیلوەیەکی نا ئاسایی پەیدا کردووە. دیوانی (ایمان بیاوریم...) تەنیا حەوت شیعری لە خۆی گرتووە، کە جگە لە شیعری حەوت ساڵی، هەر شیعرێکیان بۆ خۆی و لە جۆری خۆیدا بە گرنگترین شیعرێن فروغ دێنە ژماردن، شیعری (ایمان بیاوریم..) درێژترین شیعری فروغەو لە هەر رووییەکەوە بیگریت، شیعرێکی بەرزە. ئەم شیعرانەی فروغ لەو جۆرە شیعرانەن کە لە جادەیەك دەچن، مرۆڤ پێیدا دێو پێیدا دەڕواتو ماندوو نابێت، ئەگەر هەڵوەستەیەك بکات دیارە بۆ دیتنی شتێکە کە لە هاتوچۆیەکانی پێشووترا نەی دیتوون، بەر سەرنجی نەکەوتوون. ئینسان دەتوانێ بە ساڵان لە یەك شیعرا بخولێتەوەو ئەوجاش شتی تازە بدینێ، لەم شیعرانەدا ئاسۆ، ئۆتموسفیرو هاماج، سروشت، مرۆڤ، ژیان هەن و جۆرە ئاوێتە بوونێك لەگەڵ هەموو ئەو شتانەدا هەیە. ئەم شیعرانە دەستی خوێنەر دەگرنو دەگەڵ خۆدا دەیبەن، فێری هزرین، نۆڕین، هەستکردنو دیتنی دەکەن، فروغ لە دوای (تولدی دیگر)ەوە ژنێکە لە قەڵەمڕەوی چکۆلەی خۆیو لەو چوار دیوارەی کە تیایا ئەسیر بوو هاتووەتە دەرێو هەموو جیهانی کردووە بە مەیدانی جەولە شیعرییەکانی خۆی... لە کاتێکا شیعری فارسی لە گەرمەی رەواجو رەونەقی خۆیدا یان ئەوەندە سادەو عەوام پەسندو دروشم ئاسا بووە کە لە هەر شیعریەتێك کەوتووەو هەموو بەهایەکی گوتاریو مەعنەوی لە دەست داوە، یان بە پێچەوانەوە، ئەوەندە بەلای ئاڵۆزیو دەربڕینی مەتەڵ ئاساوە دایکێشاوە کە لەوە دەرچووە ناوی شیعری لێ بنەیت، کەچی فروغ، هەڵوێستێکی شیعریی مامناوەندی گرتۆتە بەرو ئاماژەشی بۆ ئەمە کردووە: "هەندێ شیعر وەکو دەرگای کراوەن نە لەم دیویاندا هیچ شتێك هەیەو نە لەو دیویان، دەبێ بڵێی حەیفێ بۆ کاغەزەکە. هەندێکیش وەکو دەرگای داخراوان کاتێ کە دەیان کەیتەوە، دەبین فریو دراوی، بەڵام هەندێ شیعر ئەسڵەن نە دەرگان، نە کراوەنو نە داخراون، جادەن، کورت یان درێژ فەرق ناکات. ئینسان بەردەوام پێیدا دێتو دەڕواتو بێتاقەت نابێت، ماندوو نابێت." (ارش، شماره -٨- گفت و شنود با "فروغ فروخزاد"). بە ڕاستی وایە، شیعرێك شیعر بێ دەبێ وابێ، شیعر جادەیەو تەڤگەر... فروغ یەکێك بوو لەو شاعیرانەی کە هەرگیز بازنەی لە دەوری چاو ئەندازو روئیاو خەونەکانی خۆی نەکێشاوە...

**تێبینی بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:**

- **شعر زمان ما/ ٤/ فروغ فرخزاد از محمد حقوقی چاپ دوم: ١٣٧٣= ١٩٩٤/** مؤسسة **انتشارات نگاه/ تهران ١٣٧٣.**
- **بزرگ بانوی هستی** (اسطورة، **نماد، صور ازلی)/ با مروری بر اشعار فروغ فرخزاد/ گلی ترقی / چاپ دوم: پاییز ١٣٨٧/ انتشارات نیلوفر.**

## شەشەم: فروغ لە ئاوێنەی شیعرەکانیا

((١))

فروغ جگە لەوەی شاعیرێکی بە سەلیقەو بەهرەمەند بوو، دەربارەی شیعریش زەینێکی کراوەی دوور لە تاسووبیشی هەبوو لە (مقدمە برگزیدە اشعار)دا دەربارەی شیعرێن خۆی دەڵێت: "دەمەوێ بڵێم کە تەنانەت دوای خوێندنەوەی نیماش، من زۆر شیعری خراپم گوتوون.". ئەگەر قەرار بێ کەڵە شاعیرانی سەدەی بیستەمی شیعری فارسی بژمێرین. هیچ گومان لەوەدا نیە کە فروغ یەکێکە لەو چەند شاعیرە گەورەیەی کە لەم سەدەیەدا ژیاون.

فروغ فەڕوخزاد شاعیرێکی عاتیفی، بە زمانێکی زۆر راستگۆیانەو نێوەڕۆکێن لیریکی و کاریگەرەوە، دێنە زمانو مامەڵە دەگەڵ بابەتێن زۆر تازەدا دەکات. بۆ نموونە شاعیرانی کۆن، مەگەر بەدەگمەن، دەنا کەسیان باسی ژیانی تایبەتی خۆیان نەکردووە. بەڵام فروغ راستەوخۆو

له كانگای دڵەوە هەستو سۆزی راستەقینەی خۆی دەربڕیوەو برەوی بەو جۆرە شیعرە له ئەدەبیاتی فارسیدا داوە... پایەی شیعریی فروغ، بە تایبەتی ئەگەر دەگەڵ شاعیرانی ژنی دیكەدا بەراورد بكرێت، یەجگار بەرزە، ئەو بابەتانەی ئەو هێناونیە ناو شیعرەوەو دیدو نۆڕینی ژنانەی وی بۆ جیهانو مەسەلە ئینسانیەكان، بەشێوەیەكی گشتی له شیعری ژنانی دیكەدا پێشینەیان نیە.

بۆ نموونە جارجاریٚ له شیعری مەهەستی گەنجەویدا تیمەو نێوەڕۆكی ناشیرینو بیٚ پەردە دەبینرێت، بەڵام شیعری فروغ رەنگە هەندێجار بیٚ پەرواو بیٚ منەت بیٚ بەڵام هەرگیز بیٚ پەردەو ناشیرین نیە. پەروینی ئیعتیسامی شاعیرێكی گەورەیە. بەڵام بە هۆی پێكهاتەی خانەوادەیی نەسلی پێش فروغەوە، بە حوكمی پێكهاتەی پۆلاینی نێر سالارییەوە، هیچ كاتێك باسی مەسەلە تایبەتیەكانی خۆی، باسی داخو كەسەرەكانی خۆی، بە شێوەیەكی گشتی قسەی دڵی خۆی نەكردووە. قسەی ئەو، لەم بوارانەدا، بێدەنگییەكەی بووە، جا چ بێدەنگییەكی پڕ مانا! هەڵبەتە تواناو بەهرەی شیعری پەروین ئەوەمان پێدەڵێت كە دەیتوانیو زۆر بە چاكیش دەیتوانی دیدو نۆڕینی ژنانەی خۆی بۆ دنیای ناوەوەو دەرەوە، بە شیعر بسپێرێت، هونەرمەندانە بیشیعرێنیٚو ئەدەبیاتی عاتیفیو لیریكی سەردەمی خۆی دەوڵەمەندتر بكات. بەڵام وەكو ئاماژەمان كردیٚ خەمناكترینو كاریگەرترین شیعری ئەو وەكو شاعیرێكی گەورە، لەم بوارەدا، بێدەنگیەكەی بوو. فروغ، وەكو چۆن باسی مەكینەی خەیاتی، گسك و گسكدان، موبەق، جلشۆری كردووە، بەو ئاوایەش باسی مێرد، باوك، كوڕ، مەعشوقی خۆی كردووە. باسكردنی ئەم بابەتانە بە رادەیەك له ئەدەبی فارسیدا تازە بوو كە بە هەرزەییو بیٚ ئەدەبیو بریندار‌كردنی حورمەتی ئەخلاقی كۆمەڵ تاوانبار كراوە (هەڵبەتە ئەوانە بە هەڵە له شیعرو ئەركی شیعر گەییشتوونو هەمان ئەركی وتاریان له شیعر باركردووە! لیٚ هەنووكە كە ساڵانێكی زۆر بەسەر مردنی فروغ دا بوریوە و ئاگری حەزو رقو پێشداوەریانی كاڵوكرچو پەلەو هەڵسەنگاندنی نازانستی، تا رادەیەك دامركاوەتەوە، دەكریٚ بە چاوێكی واقیعی تر تەمەشای شیعری ئەو بكرێتو بە گوێرەی رێڕەوی مێژوویی تێكڕای بزاڤی ئەدەبیٚ فارسی پێگەو پایەی ئەو له جوگرافیای ئەدەبیاتی فارسیدا دیاری بكرێتو بناسێنرێت... فروغ شاعیرێك بوو كە ڕاستگۆیانەو بە ئینسافەوەو هونەریانە له ژیانو ماڵو كۆمەڵگە دواوەو ئەدەبیاتی فارسی زۆری پێویست بەو جۆرە دیدو نۆڕینە هەبوو. فروغ، بە دەم ئەزموونی ژیانو شیعرەوە ئەوەی كەشف كرد كە دەشێت بە زمانی سادە قسە بكرێت، بۆیە لەو پێودانگەوە بە زمانی ئاسایی خەڵكی، باسی پرسە گرنگەكانی ئێرانو ئێرانیانی سەردەمی تازەی كردووەو خۆی لەو زمانە قەبەو قەڵەوو پڕ تەكەلوفە بواردووە كە له ئەدەبیاتی كۆندا باو بووە، هەر بۆیەش ئێرانی ئەمڕۆ بە ئاسانی ئاوێتەی شیعرەكانی بووەو بە چری له شیعرەكانیا ڕەنگی داوەتەوە... دیارە هونەرمەندی گەورە له هەوڵی ئەوەدایە ئەزموونانی تایبەتی خۆی له بۆتەی كارە هونەرییەكەیدا قاڵ بكاتەوەو بیگۆڕێت بۆ ئەزموونانی گشتیو هەمە زەمانی، كە ئەگەر لەم كارەدا سەركەوتن بە دەست بێنێت، هونەرەكەی سنووری زەمان و رۆژگاری خۆی بە باڵی هونەرو ئافراندن دەبەزێنیٚو بە زمانی هونەر خەڵكی هەموو دنیا

دەدوێنیٚ‌و دەبێت بە وێردی سەر زاری خەڵکی هەموو سەردەمەکان. جا فروغ لە زۆر بواردا، ئەزموونانی تایبەتی خۆی لە مەیدانی ڤیان‌و ئەشقدا، لە شکانا، لە ژیانی... لە بۆتەی ئەزموونانی گشتیدا قاڵ کردووەتەوەو گشتایەتیەکی هونەری ئەوتۆی پیٚ بەخشیوە کە بووە بە بەشێکی دانەبڕاو لە ئەزموونی گشتی‌و لەم رووەوە نەك هەر لە زەمان‌و رۆژگاری خۆیدا بەڵکو تا شیعر بمێنیٚ هەمیشە خەڵکانێك دەبن دەگەڵ شیعرەکانیا بژین. فروغ بە ڕاستی وەکو هەر شاعیرێکی گەورەو ڕەسەن پەیڤداری ئیعتراف پێنەکراو یان بە گوتەیەکی دی پەیڤداری نافەرمی هەموو ئەو کەسانەیە کە وەکو ئەو دەبینن، وەکو ئەو بیردەکەنەوە، بەڵام توانا گوتنەوانیەکانی ئەویان نییە.

ئەگەرچی زمانی فروغ لە بونیادا، زمانی رۆژو سادەیە، بەڵام لە رووی کرۆك‌و جەوهەری ئەدەبییەوە، لە لێکچوون‌و خواستن‌و خوازەو رەمزێن پڕ بەها خاڵی نیەو لەم رووەوە خزمەتێکی شایانی بە زمانی ئەدەبی سەردەمی خۆی کردووەو کۆمەڵێك ڕەهەندی تازەی کردووەتەوەو ئیمکاناتی شایستەی کەشف کردووە. هەڵبەتە وەکو پێشتریش ئاماژەمان کردیٚ، فروغ ئەگەرچی لە بنەڕەتدا شاعیرێکی لیریکییەو هەست‌و سۆز، سیفەتی زاڵی هەموو شتەکانیەتی، بەڵام لە روویەکی ترەوە، وەکو زۆربەی گەورە شاعیران، بە یەکێك لە دیرۆکنووسانی ئەدەبی مێژوو و کۆمەڵگەی سەردەمی خۆی دادەنرێت‌و لەم رووەوە دەبێتە سەرچاوە بۆ ئەو توێژەرانە کە لە ئایندەدا مێژووی کۆمەڵایەتی سیاسی ئەم سەردەمە دەخەنە بەر وردەبینی لێکۆڵینەوەوە.

((٢))

فروغ لە پێشەکی "برگزیده اشعار"دا دەڵێت: "شیعر بۆ من وەکو پەنجەرەیەکە هەر کاتیٚ بەرەو لای دەچم خۆ بە خۆ دەکرێتەوە. من لەبەریا دادەنیشم، تەمەشا دەکەم، گۆرانی دەڵێم، هاوار دەکەم، دەگریم. ئاوێتەی وێنەی درەختەکان دەبم‌و دەزانم کە لەو دیوی پەنجەرەکەدا فەزاو هاماجێك هەیەو کەسێك گویٚ دەگرێت، کەسێك لەوەیە خەڵکی دوو سەدساڵی دی بێت، یا خەڵکی سیٚ سەد ساڵی لەمە پێش بووبیٚ."

وا باوە کە هەر هونەرمەندێکی گەورە شاکارێکی گەورەو بەرجەستەی هەیە کە دەکاتە کاکڵەو پوختەی تێکڕای راوبۆچوون و هونەرو ژیانی ئەو، یانی دەکاتە مانیڤێستی ئەنتولوژی‌و هونەری ئەو، دەکاتە لوتکەی کارەکانی‌و لە بەرهەمەکانی تری، زیاتر شاعیر نیشاندەدات‌و دەیناسێنیٚ، بۆ نموونە سهرابی سپهری بە چامەی (سەدای پای ئاب)و (مسافر) کە پوختەو کاکڵەی هەموو شیعرەکانیەتی، بەناوبانگە، مەولانا بە مەسنەوی بەناوبانگە، ئەحمەدی خانی بەمەم‌و زین، ئیلیوت بە وێرانەخاك، دانتی بە کومیدیای خوایی، هومەر بە ئیلیادە... هتد. بەناوبانگن... هەڵبەتە هەموو شاعیرێك ناگاتە ئەم ئاستە، بە زۆری ئەوانە دەگەنە ئەم ئاستە کە گەیی بنە سیستەمێکی فیکری یان هەست‌و سۆزێکی بە جۆش‌و خرۆش‌و بەردەوام لە پشت شیعرەکەیەوە بێت. چونکە هیچ چامەو بەیتێکی شیعری لە یەك دوو سەعاتاندا نایەتە گوتن یان نووسین، بۆیە دەبیٚ شاعیر بۆ ماوەیەکی زۆر لە سەر یەك حاڵەتی جێگیری شیعریدا بێت. واتە مەنزومە (بەیت) بە هەموو درێژییەکی خۆیەوە لەسەر یەك هێڵی جێگیری فیکری‌و سۆزداری

بڕوات. مەنزومە (بەیت) دەرفەتی شاعیر دەدات کە تێکڕای سات و دەمە گرینگە فیکری و عاتیفییەکانی خۆی دەور بکاتەوەو بگێڕێتەوەو بەوپەڕی ئازادی خۆی، بەلای کەمەوە بۆ خۆی، بگێڕێتەوەو ئاشکرا بکات. جا کە باسەکەمان، لێرەدا باسی فروغە، دەکرێت شیعری (ایمان بیاوریم به اغاز فصل سرد) بە باشترین و کاریگەرترین و گرینگترین مەنزمەوی فروغ دابنرێت، کێ لە ئێمە، یان لە کچانمان، یان خوشکانمان، یان دایکانمان هەیە کە خۆی لەو شیعرەدا نەبینێتەوە؟ فروغ لەم شیعرەدا، بە زمانی ئەدەبی ئەمڕۆ، بە زمانێکی زۆر عاتیفی و کاریگەرو خەمناك، بەوپەڕی بەلاغەت و فەساحەتەوە، سەربهوردی شکستی خۆی لە ژیانا و بە تایبەتی لە ژیانی ژن و مێردایەتیداو چۆنیەتی جیابوونەوەی لەو پیاوەی کە خۆشی ویست (زاهیری مەبەستی مێردەکەیەتی) بە شێوەی یادگارێن پەراگەندە دەگێڕێتەوە، هەڵبەتە لە پێچ و پەناو پەسێرانی ئەم تیمەو نێوەڕۆکەوە، ئاماژە بۆ بابەتێن دیکەش دەکات. (فروغ لە ساڵی ١٣٣٠دا لە تەمەنی شازدە ساڵیدا شوو دەکات، بە خۆشەویستی شووی کرد. لێ سەرەنجام دووچاری نائومێدی و شکست دەبێت و دوای سێ ساڵ لە مێردەکەی جیا دەبێتەوە. ئەم شکستە کارێکی قووڵ لە دڵ و دەروونی دەکات کە بە زۆری لە شیعرەکانیا ڕەنگی داوەتەوە... بە هەر حاڵ بابەتی سەرەکی زۆربەی شیعرەکانی فروغ، گەڕانەوەیە بۆ یادگارێن ڕابردوو و سەردەمێن منداڵی و، داخ و حەسرەتە بۆ تەمەنی بە باچووی خۆی ) .

فروغ لەم شیعرەدا (ایمان بیاوریم به اغاز فصل سرد، کە ٢٥٥ دێڕە) قسەو دیدی خۆی سەبارەت بە ژیان بە گشتی و ژیانی تایبەتی و ڕابردووی خۆی، بە تایبەتی دەردەبڕێت. ئەم شیعرە لە ڕاستیا زمزەمەو چپە چپێکە کە شاعیر لە ڕۆژێکی ساردی زستانیدا دەگەڵ خۆیدا دەکات، بەڵام ئەوانەی کە لە نزیکی ئاستانەی روحی ئەودا وەستا بن، دەتوانن گوێی لێبگرن و گوێیان لێی ببێت. شاعیر، لەم شیعرەدا یەك موخاتەبی هەیە کە پێی دەڵێت: "ئەی یار، ئەی تاقانەترین یار!" و ئەم یارە لە ڕاستیدا بوونی یەکگرتووی شاعیرە دەگەڵ ئەو پیاوەدا. جا چونکە ئەم شیعرە گێڕانەوەی بیرەوریانە، لە رووی بونیادێن مانایی و زمانەوانییەوە لەسەر بناغەی دووبارە کردنەوە ڕۆنراوە. ڕستەو وشەکان بەردەوام دووبارە دەبنەوە، وەکو چۆن بیرەوەریان لە زەیندا دووبارە دەبنەوە.

شیعرەکە بە وەسفی نائومێدی ژنێك دەست پێدەکات، ژنێ کە لەبەر ئاسانەی وەرزێکی ساردا وەستاوە. وەرزی زستان کە رەمزی مەرگ و فەوتان و پەریشانی و وێرانییە. دەستەکانی کۆنکرێتی و بێ توانان و رزگارکەرو فریارەسەکەشی کە روحیەتی خۆیەتی، لە گۆڕا خەوتووە... بیر لە جووتگیری گوڵان دەکاتەوە، یانی بیر لە کۆتایی زستان و دەستپێکی بەهار دەکاتەوە، بەڵام ئەم بەهارە لە ئایندەدا نییە، لە رابردووی ئەودایە، چونکە ئایندەی ئەو هیچ تروسکەیەکی تیا نییە.

بە هەر حاڵ ئەم مەنزوومەیە ( ایمان بیاوریم...) یەکێکە لە دوا شیعرەکانی فروغ..بەڵێ شاعیر هەرچی دەکات و دەکۆشێت ناتوانێت لەم سەرمایە رزگار بێت، خۆی لەم فەناو پەریشانیە بدزێتەوە، کەواتە باشتر وایە، ئەم حەقیقەتە تاڵە قەبووڵ بکات. ناتوانێ یادگارییەکانی ئەو پیاوە

فەرامۆش بکات‌و خاکی مەزاری ئەو دوو دەستە جەوانە هێشتا تازەیە (دەست، خۆی‌و ئەوە لە بوونێکی یەکگرتوودا). کەواتە ناچار دەبیٚ بە سەرەتای وەرزی سارد، بە سەرەتای پیری‌و تەنیاییەکی گەورە، باوەڕ بێنیٚ، دانی پێدا بنێت، ئەمە تیمەو نێوەڕۆکی سەرەکی شیعرەکەیە... بەڵیٚ، بەمجۆرە فروغ، وەکو گەورە شاعیرانی دیکە، مەسەلەو پرسە تایبەتی‌و بچووکەکانی دەوروبەری خۆی دەگۆڕێت بۆ پرس‌و مەسەلەێن گەورەو نەمرییان پێدەبەخشێت.. رووداوێك لە زەمان‌و شوێنێکی تایبەتیدا دەگۆڕدرێت بۆ شیعرێکی میتا زەمان‌و هەر ئەمەش رازو نهێنی هونەرە: نەمر بوون‌و نەمر کردن...

((٣))

فروغ دەڵێت: "وشە بەلای منەوە یەجگار گرینگە، هەر وشەیەك روحیەت‌و تایبەتمەندی خۆی هەیە."

هەندیٚ وشە هەن کە لە شیعری فروغدا زۆر دووبارە بوونەتەوەو تایبەتمەندی خۆیان وەرگرتووە. وشەێن وەکو: دەست، ئاوێنە، کەزی، حەجم... بە هەر حاڵ فروغ وەکو هەر شاعیرێکی گەورەی دی خاوەنی فەرهەنگێکی وشەوانی تایبەتی‌و وەك دەڵێن تیرمینولوژییە.. جا لێرەدا مەبەست ئەوە نییە کە فروغ هاتووە بە خۆی وشەی تایبەتی داتاشیوەو زاراوەی دروست کردووە، بەڵکو مەبەست ئەمەیە کە رەفتارێکی زەینی تایبەتی ئەوتۆی دەگەڵ هەندیٚ پەیڤ‌و وشاندا کردووە کە هەندیٚ لەو پەیڤ‌و وشانە لە شیعری ئەودا مانای تایبەتیان پەیدا کردووە. گەلێك لەم وشانە لایەنی رەمزییان پەیدا کردووەو هەیە. فروغ بە زۆری چ لە مەسەلە فەردییەکانی خۆیداو چ لە مەسەلە کۆمەڵایەتیەکاندا زمانێکی رەمزی هەیە. هەڵبەتە مرۆڤ کە دێتە سەر باسی لایەنە تایبەتیەکانی ژیانی تایبەتی خۆی، حەز ناکات پەنا بەرێتە بەر زمانێکی راستەوخۆو بیٚ پەردە، لەم رووەوە چ بە شێوەیەکی ئاگایی یان نا ئاگایی، پەنا دەباتە بەر رەمز. فروغ شاعیرێك بوو کە لەوانی دی زیاتر باسی ژیانی تایبەتی خۆی‌و ئەزموونێن شکست‌و خەمناك‌و بە سوێی ژنی لە کۆمەڵی پیاو سالاریدا کردووە. لە نامەیەکدا دەڵێت: "هەمیشە هەوڵم داوە وەکو دەرگایەکی داخراو وابم تا هیچ کەسێك ژیانی ترسناکی دەروونیم نەبێنیٚ‌و نەزانیٚ." بە هەر حاڵ هونەرمەندان لەم جۆرە حاڵەتانەدا پەنا بۆ هونەری خۆ دەبەن، ئیدی شیعر بیٚ، موزیقا بیٚ، نیگارکێشی بیٚ.... کە بە تەبیعەت‌و لە جەوهەرو کرۆکدا، لایەنی رەمزی‌و ناراستەوخۆییان هەیە... نموونەی زمانی رەمزی فروغ لەم دێڕانەدا بە جوانی دەبینرێت:

دووبارە سڵاو لە هەتاو دەکەم

لە جۆبار کە لە مندا رەوان بوو

لە هەوران کە بیروخەیاڵاتی دوورو درێژم بوون

لە گەشەکردنی دەردناکی سپیدارانی باغ کە دەگەڵ منا

بە وەرزە وشکەکانا رەت دەبوون.

لەم شیعرەدا هەتاو، ئومێدو روناکی، جۆبار، ژیانێکی سستو ئارامو زەمزەمەئاسا، هەوران، هزرێن تاریکو نا ئومیدیو رەشبینیو خەم، سپیدار، ئەندێشەی ژیانو مردنی پەی دەرپەیو، وەرزێن وشکی ژیانی بۆشو بەتاڵو دژوار، وەبیر دێننەوە.

زمـانی فـروغ، زمانێکـە پـڕ ئاهـەنگو هـاو ئاهـەنگو هـەڵقوڵاوی کانگـای دڵو ڕەوان، رەنگـە نزیکترین زمانی ئەدەبی بێت لە تەبیعەتی زمانی قسەکردنی ئاساییەوە کە نیما زۆری بانگەواز بۆ دەکرد. ئەم زمانە مۆسیقای خۆی زیاتر لە دیالۆگو گێرانەوەوە وەرگرتووە تا لە عەروزەوە.

ئەم زمانە لەلایەکی ترەوە، یەجگار پڕسۆزو عاتیفی و کاریگەرە، چونکە لە کانگای دڵەوە هەڵقوڵاوەو بۆنی ڕاستگۆییو پاکیو سادەیی لێدێت. لەلایەکی ترەوە زمانێکی ئەدەبییە، لیٚ زمانی ئەدەبی رۆژگاری ئەمڕۆ نەك ئەدەبیاتی هەزار ساڵ لەمە پێش!... جا فروغ وەکو چۆن لە رووی ماناوە شاعیری سەردەمی ئەمڕۆیە، بەو ئاوایە لە رووی زمانیشەوە شاعیری رۆژگاری ئەمڕۆیە.. زمانێکی هێندە سرکو زندووی بە کاربردووە کە شاعیرانێکی زۆر کەوتوونەتە ژێر کاریگەری ئەوەوە، بۆ نموونە زمانی سپەهری نزیکترین زمانە لە زمانی فروغەوە، زمانی ئەمانە بە رادەیەك لێکدیەوە نزیکن کە خوێنەر هەندێجار و لە هەندیٚ شیعردا بە هەڵەدا دەچێتو بە ئاسانی لێکتریان جیاناکاتەوە، هەڵبەتە سپەهریش وەکو فروغ سوودی لە ئاهەنگی زمانی فارسی ئەمڕۆ وەرگرتووەو هەمان فارسی زندوو و باوی ئەمڕۆی رەچاو کردووە. دیارە پێویستە هەر شاعیرێکی گەورە بە زمانی سەردەمی خۆی قسان بکات. زمانێك کە هەڵقوڵاوی دیالۆگو گفتوگۆی رۆژانەی خەڵکیو گفتوگۆی ئاسایی ژیانی رۆژانەیە. ڕەگی موسیقای شیعر لە زماندایە،و پێویستە مۆسیقای باوو پەسندی خەڵکی هەمان رۆژگار بێت. کاتیٚ کە خوێنەر شیعرێك دەخوێنێتەوە یان گوێگر گوێی لێدەبێت، لە دڵی خۆیدا بڵێت ئەگەر قەرار بوایە من بە زمانی شیعر باخفم، بە هەمان شێوە دەپەڤیم. لەبەر ئەمەیە کە شیعرێن سەردەمی ئێمە هەستێکمان لا دروست دەکەن کە شیعرێن زۆر چاکتری سەردەمانی کۆن، ئەو هەستەیان لەلامان پیٚ دروست ناکرێت..

فروغ، یەکێکە لەو شاعیرانەی کە گرینگی بە زمانی تایبەتی خۆیو گرینگی زمان لە گوێزانەوەی هەستو چێکردنی موسیقادا، داوەو لە گفتوگۆیەکانی خۆیدا، قسەی لەسەر ئەم لایەنە کردووە، بۆ نموونە لە (مقدمە: برگزیدە اشعار)دا دەڵێت: ... من تەمەشای دەوروبەرم، شتەکانی دەوروبەرمو خەڵکەکەی دەوروبەرمو هێڵە گشتیەکانی ئەم دنیایەم کرد، کەشفم کردنو وەختیٚ ویستم بیڵێم، بیگێڕمەوە، سەیرم کرد پێویستم بە وشەیە، وشەێن تازە کە هی هەمان دنیا بن... وشەم هێنان. چ قەیدیە کە ئەم وشانە هێشتا نەبوون بە وشەی شاعیرانە، خۆ گیانیان تیایە! دەیانکەین بە وشەی شاعیرانە. وشە پەیدا بوون، ئەوسا مەسەلەی زەرورەتی گۆڕینو دەستکاری لە کێشی وشەکاندا هاتە پێشەوە.

توانایێن زمانی فارسی زۆر زۆرە. ئەم خەسڵەتەم لەزمانی فارسیدا کەشفکرد کە دەشێت بە سادەیی قسە بکرێت...یانی بە هەمان ئەم سادەییەی کە من ئێستا دەگەڵ تۆدا قسە دەکەم.

من گویم له پێشینەی شیعریی وشەو شتەکان نییە. من چبکەم کە تا ئێستا هیچ شاعیرێکی فارسی زمان بۆ نموونە وشەی "انفجار= تەقینەوە"ی لە شیعردا بەکار نەبردووە.

ئەگەر دیدو نۆڕین، نۆڕین و دیدی ئەمڕۆیی بێت، زمانیش وشەێن خۆی دەدۆزێتەوەو هاوئاهەنگی ئەم وشانە دابین دەکات. وەختێ زمان پوختە بوو، گریێ و گۆڵی تیا نەما، یەکدەست و ڕەوان بوو کێشی خۆی دەگەڵ خۆیدا دێنێ و بەسەر کێش و وەزنە باوەکانیا دەسەپێنێ. من ڕستە، بە هەمان سادەیی کە لە مێشکما دروست دەبێ، دەخەمە سەر کاغەزو کێش وەکو داوێکە کە بە بەینی ئەو وشانەدا ڕەت دەبێت.

لە زمانی فارسیدا ئەو کێشانەی کە ریتم و ئاهەنگی کەمتریان هەیەو لە ئاهەنگ و ریتمی گفتوگۆوە نزیکترین، دەکرێت هەر ئەو کێشانە بهێنرێن و پەرەیان پێ بدرێت... ئەوەی کە کێش دروست دەکات و دەبێ کێش دابین بکات، بە پێچەوانەی رابردووەوە، زمانە: هەستی زمان، غەریزەی وشەو ریتمی دەربڕینی ئاسایی و سروشتی وشانە.

پێویستە واقیعی ترین و بەرجەستەترین وشە بێتە هەڵبژاردن، تەنانەت ئەگەر شاعیرانەش نەبێت.

ئەم دوو پرسە، واتە کێش و زمان لێکدی جیا نین، پێکەوە دێن و کلیلیان لە ناو خۆیاندایە. زمان، کێش بەگەڵ خۆی دەخات...

((٤))

وتمان هەندێ وشە هەن کە لە شیعری فروغ دا بە رادەیەك دووبارە بوونەتەوە کە دەشێت بە ناسنامەی شیعری ئەو دابنرێن یان بە کلیلی کردنەوەی دنیای شیعرەکانی ئەو دابنرێن و زۆرجاریش شەقڵی ڕەمزییەتیان پەیدا کردووە، جێی خۆیەتی لێرەدا چەند وشەیەك لەو وشانە بە نموونە بێنینەوە، کە ڕەنگە خوێنەران بتوانن لەو ڕێگایەوە، زیاتر ئاشنای ئوتموسفێرو هاماجی گشتی شیعری فروغ ببن... بۆ نموونە وشەی خۆر (هەتاو) لە هەموو ئەم شیعرانەدا دووبارە دەبێتەوە: (ئەو ڕۆژانە، هەتاو هەڵدێ، دان بە سەرەتای وەرزی ساردا بنەین، خەیاڵی کەسك، سڵاوی دووبارە لە هەتاو دەکەم، پەنجەرە، تەنیا دەنگە کە دەمێنێ، باڵندە مردەنیە.)

دیارە خۆر یان هەتاو لێرەدا ڕەمزی ژیان و ژین وئومێد هیواو یادەوەری ڕۆژانی خۆشی ژیانە (لە رابردوودا). یان وشەی زستان و بەفر: کە لەم شیعرانەدا دووبارە دەبێتەوە: (ئەو ڕۆژانە، دان بە سەرەتای وەرزی ساردا بنەین) دیارە ئەو وشانە دەنگدانەوەیەکی باش و ئەرێنیان هەیە، چونکە پاکی و بێگەردی و سپێتی و ئارامی و هێوری وەبیر دێننەوە، ڕەگیان دەچێتەوە سەر ئەو چەمك و مانایانە. باشترین شیعری فروغ کە (ایمان بیاوەریم به اغاز فصل سرد)ـە، گێڕانەوەیەکی بیرەوەریانەی خەمناك و بە ئازارە لە زستاندا. فروغ لە زستاندا لە دایك بووەو لە زستاندا کۆچی دوایی کردووە (لە ڕۆژی ١٥/دی ما/ ١٣١٣ لە دایك بووەو لە ٢٤/بهمن/ ١٣٤٥دا کۆچی دوایی کردووە).

یان وشەی هاوین و سەوز: کە لە هەردوو شیعری (لە ئاوە کەسکەکاندا، وەهمی کەسك) دووبارە دەبنەوەو بیرەوەریە خۆشەکانی رابردوو وەبیر دێننەوە.

یان وشەی درەخت (نەمام) کە لە شیعری (تەنیا دەنگە کە دەمێنێ، دڵم بە باخچە دەسووتێ، پەنجەرە، باوەڕ بێنین بە...، لە دایکبوونێکی تر، لە نێو تاریکیدا، لەسەر خاك، با دەمانبات، گوزەران)دا دووبارە دەبنەوەو درەخت بە شێوەیەکی گشتی ژیان‌و هەندێجار بەشێکە لە بەشەکانی ژیان‌و هەندێجار رەمزی شاعیر خۆیەتی کە با وێرانی کردووە... درەخت رەمزی ژیانی ئەبەدی و لە فەوتان نەهاتووە، لەو رووەشەوە کە رەگی درەخت لە زەویدایەو لق‌و پۆپی لە ئاسماندایە، ئەمە نیشانەی پەیوەندی نێوان  هەرسێ جیهانی: دۆزەخ، زەوی، وبەهەشتە،هەروەها درەخت ڕەمزی تەبیعەتی بەشەرییەو رەمزی رێرەوی لە کۆتایی نەهاتووی ژیانە...

یان وشەی چەمەنزار کە لە شیعری (فەتحی باخ، ئاشقانە، دوای تۆ)دا دووبارە بووەتەوە، ئەمیش وەکو درەخت رەمزی ژیان‌و بوون‌و ئارامی‌و بیرەوەریانی خۆشە.

یان وشەی (باخچە) کە لە شیعری: (فەتحی باخ، دڵم بە باخچە دەسووتێ)دا دووبارە دەبێتەوە، باخچەش هەڤبەند دەگەڵ درەخت‌و چەمەنزاردا رەمزی ژیانی گشتی، ژیانی خانەوادەیی‌و ژیانی خودی شاعیرە. لە فەرهەنگی رەمزاندا باخ رەمزی خودئاگایی‌و جەنگەڵ‌و بێشە رەمزی ناخودئاگاییە.

یان وشەی (سەوز) کە لە شیعری: (ئەو رۆژانە، با دەمانبات، بە هەتاو...، دڵم بە باخچە دەسووتێ)دا، لێرەدا رەمزی نەشوونماو ژیان‌و یادگارە خۆشەکانە.

یان (زەوی) کە لە شیعرێن: (فەتحی باخ، باوەڕ بێنین بە....)دا دووبارە دەبێتەوە، رەمزی بوون‌و سروشتە.

یان (پەنجەرە) کە لە شیعرێن: (گوزەران، با دەمانبات، لە غروبی ئەبەدیا، پەنجەرە، دیاری، دیدار لە شەوا، خەیاڵی سەوز، من لە تۆدا دەمردم، پەنجەرە، کەسێك کە وەکو هیچ کەسێکنیە)دا دووبارە دەبێتەوە.رەمزی هیواو نوورو روناکی‌و دەروشانەوەو ئایندەو ئەوزاری پەیوەندیە. پەنجەرەی زۆر خۆشدەوێ‌و ناوی یەکێك لە شیعرەکانی ئەوە. پەنجەرە تاقە ئەوزاری پەیوەندی ئەوە بە جیهانی دەرەوە. هەندێجار پەنجەرە بە ماناو چەمکی چاو و زەین بە کار دەبات بەو ئیحتوبارەی کە هەندێجار پەنجەرە رەمزی خودی شاعیرە. هەروەها پەنجەرە رەمزی خودئاگاییەشە، بە تایبەتی ئەگەر لە بڵندایی دا بێت.

یان کەزی (گێسو) کە لە شیعری: (ببورە، من لە تۆدا دەمردم، شیعری سەفەر، لە ئاوی سەوزی هاوینا، فەتحی باخ، سڵاوی دووبارە لە هەتاو دەکەم، پەنجەرە)دا دووبارە دەبێتەوە. کە بەلای شاعیرەوە‌و لە نۆرینی ژنانەی ئەوەوە گرینگترین بەشی بەدەنەو، ئینسان لە شیعری ئەودا بە دەست‌و کەزی تایبەتمەندی خۆی پەیدا دەکات... لە فەرهەنگی رەمزاندا قژ دارایی رۆحانی‌و مەعنەوی ئینسانەو نیشانەی گەشەکردنی مەعنەویەو لە دەستدانی نیشانەی شکست‌و هەژارییە..

یان وشەی (باڵندە) کە لە شیعری: (تەنیا دەنگە کە دەمێنێ، دوای تۆ ، باوەڕ بێنین...، باڵندە، هەر یەك باڵندە بوو، دیدار لە شەوا، باڵندە مردەنییە.)دا دووبارە دەبێتەوە، رەمزی روح‌و

فریشتەیە، هەروەها ڕەمزی بەرزەفڕی ئەندێشەو خەیاڵاتە، دیارە لە خەیاڵدانی ئەفسانانی کۆنیشدا روح، باڵندەیەو دەگوترێت روحی لە قەفەزی سینە هەڵفڕی. باڵندە لە وشە خۆشەویستەکانی فروغەو ناوی چەند شیعرێکی وی راستەوخۆ بە وشەی باڵندەوە پەیوەستە. دوا شیعری فروغ ناوی (باڵندە مردەنیە)یە.

یان وشەی (چۆلەکە= چێشکە= پاساری): کە ڕەمزی شادیو خۆشی ژیانە، ڕەمزی چالاکیو چەلەنگی جۆشو خرۆشە، لەم شیعرانەی فروغ دا دووبارە دەبێتەوە: (ئەو ڕۆژانە، من لە تۆدا دەمردم، باڵندە مردەنیە).

یان وشەی (کۆتر) کە ڕەمزی روحەو سلاڤییەکان باوەڕیان وایە روح لە دوای مردن دەبێت بە کۆتر، کۆتریش ڕەمزی هێزێن مەعنەوی و باڵایە. کۆتر یەکێکی ترە لەو باڵندانەی کە لە شیعری فروغ دا ناوی هاتووەو لەم شیعرانەدا دووبارە بووەتەوە: (لە غروبی ئەبەدیا، نیشانە زەمینییەکان، فەتحی باخ.)

یان (کوچە= کوجی)، کە ڕەمزی رابردوو و سەردەمانی خۆشی منداڵیو تێپەڕبوونی تەمەنو هەندێجار ڕەمزی ژیانو کۆمەڵە، یەکێکە لەو وشانەی لە زۆر شیعری فروغ دا دووبارە بووەتەوە وەك: (من لە تۆدا دەمردم، لە غرووبی ئەبەدیا، لە ئاوی سەوزی هاوینا، ئەو ڕۆژانە، پەنجەرە، دیاری، هەینی).

یان وشەی (ئاوێنە) کە لەم شیعرانەدا دووبارە دەبێتەوە: (دیدار لە شەوا، خەیاڵی سەوز، بە هەتاو، من لە تۆدا دەمردم، لە دایکبوونێکی تر، باوەڕبێنین بە سەرەتای وەرزی سارد). لە مانا گشتییەکەیدا ڕەمزی زەینو دڵو بیرەوەریانە. هەندێجار ڕەمزی سفرەی مارە بڕینە کە لای خەڵکی بە "ئاوێنەی بەخت" ناسراوەو هەندێجار ڕەمزی پاکیو بێگەردییە... (سفرەی مارەبڕین، سفرەیەکە لە ڕێورەسمی مارەبڕینا لە بەردەم بووكو زاوادا رادەخرێتو ئاوێنەو مۆمدان، قورئانو هەندێ خۆراکی بارگاوی بە ڕەمزی وەکو (نان، پەنیر، سەوزی، شیرینی، هەنگوینی....." لەسەر دادەنەن.

یان وشەی (ئەستێرە) کە لەم شیعرانەدا دووبارە دەبێتەوە: (دڵم بە باخچە دەسووتێ، پرسیار، لەسەر خاك) هەندێجار ڕەمزی ئومێدو بەختەوەریەو هەندێجار ئاماژەیە بۆ پولەکەی جلکی بووکێنی.

یان وشەی "دەریاو ئۆقیانووس" کە لەم شیعرانەدا (دیدار لە شەوا، خەیاڵی سەوز، لە دایکبوونێکی تر، باوەڕبێنین...، ماشوقی من،)دا دووبارە بوونەتەوە، هەندێجار ڕەمزی بوونو ژیانە، هەندێجار ڕەمزی قووڵی یادگاریانە،و هەندیجار نیشانەو دەلالەتی تەنیاییو غوربەتو مردنە... ئۆقیانوس هەندێجاریش ڕەمزی ژن یان دایکەو گەڕانەوە بۆ دەریا بە مانای گەڕانەوە بۆ لای دایكو بەپیرەوەچوونی مەرگە. یان (چرا) کە ڕەمزی هیواو بەختەوەرىو ڤیانو مەکۆی خانەوادەییە لەم شیعرانەدا دووبارە دەبێتەوە: (دیاری، من لە تۆ دا دەمردم، پەنجەرە، باڵندە مردەنیە.)

یان وشەی (دەست) یەکێکە لەو وشانەی کە فروغ زۆری حەز لێدەکاتو لە هەموو ئەم شیعرانەدا دووبارە کراوەتەوە: (ئەو رۆژانە، ویسالْ، تەنیایی مانگ، نیشانە زەمینییەکان، فەتحی باخ، لە دایکبوونێکی تر، پەنجەرە، دڵم بە باخچە دەسووتیْ.)

((٥))

هەوێن یا مۆتیف، یان تیمە، بابەتێکە لە تێکڕای ئەدەبیاتی ولآتێکا یان لە کۆی بەرهەمی کەسێك دا، یان لە سەرانسەری بەرهەمێکی تایبەتی هونەریدا، بەردەوام دووبارە دەبێتەوەو دەبێت بە بناغەو هێمی کارە ئەدەبییەکە... زۆربەی کارە ئەدەبیە ناوازەکان، بە تیمەیەکی پەنهان بارگاوینو ئەم تیمەیە لە سەرانسەری بەرهەمەکەدا تۆو دراوەو بە شێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە بندێری بەرهەمەکەدا بەرجەستە کراوەو چاو شارکیْ دەگەڵ خوێنەرا دەکات... جا شیعری فروغ، وەکو شاعیرێکی گەورە، گەلێك لەم تیمەو موتیفو هەوێنانەی تێدایەو خوێنەری جددی زۆر بە ئاسانی هەستیان پێدەکات، لەوانە بۆ نموونە بابەتی مردنو زەواڵو پۆسیان، یەکێکە لە بابەتو تیمە سەرەکییەکانی شیعری فروغ. کە سەرەنجام لە شیعری (باوەڕ بێنین بە سەرەتای وەرزی سارد)دا مل بۆ حەقیقەتی فەناو نەمان دەدات. بۆیە پێی وایە کە کاری هونەری خۆی لە خۆیدا جۆرە ڕوو بە ڕووبوونەوەیەکی مەرگو زەواڵو فەنایە، هەوڵدانە بۆ وەدەستهێنانی جۆرە نەمرییەك... کاری هونەری جۆرە هەوڵێکە بۆ نەمربوونو نەمرکردنی خودو سڕینەوەی مانای مەرگو مردن... کەچی وێڕای ئەوەش دەڵێت: ".... هەندێجار بیر دەکەمەوە دروستە کە مردنیش یەکێکە لە یاساکانی تەبیعەت، بەڵام بنیادەم تەنیا لە هەنبەر یاسادا هەست بە حەقارەتو بچووکی دەکات. ئەمە پرسێکە کە هیچ کارێکی دەگەڵدا ناکرێت، تەنانەت ناکرێت دژی نەهێشتنیشی خەبات بکرێت، بیْ فایدەیە، دەبیْ هەبیْ." (بڕوانە: مقدمە برگزیدە اشعار.) تەنانەت ئەشقو ویساڵیش لە زەینی فروغ دا جۆرە خەرمانەیەکی مەرگو زەواڵ، دەوری داوە. لە نامەیەکیا بۆ برایەکەی دەنووسێت: "بنیادەم دەبیْ لە لفی خۆی بگەڕێتو هەر کەسێك لفێکی هەیە. پێویستە لفی خۆی بدۆزێتەوە، دەگەڵیا بخەویْو بمرێت. مانای هەڤخەوی ئەمەیە، یانی کامڵ بوونو مردن" (بڕوانە: مجلە فردوسی، ٢٧/مرداد/ ١٣٤٨).

تیمەیەکی دیکەی شیعرەکانی فروغ، نا ئومێدی و رەشبینی و بەدگومانیە. نائومێدی لە شیعرەکانیا هاوار دەکات، هیچ ئومێدێك بە ئایندە نیە. هەر خۆشییەك هەیە لە ڕابردوودا تەواو بووەو بڕاوەتەوە. تاریکیو شکستو داڕوخان گەمارۆی ئایندەی داوە. ئەمە بە زەقی لە شیعرێن (با دەمانبات، نیشانە زەمینییەکان، خەیاڵی سەون)دا بەدی دەکرێت.

هەروەها خۆزی خواستن بە ڕابردوو، یەکێکە لە مۆتیفە زاڵەکانی شیعری فروغ، ئەمە لە مۆتیفە باوەکانی شیعری فارسییە، شاعیرانی سەردەمی سەلجوقی بە داخو کەسەرەوە یادی شاعیرانی سەردەمی مەحموودی دەکەنەوەو شاعیرانی سەردەمی مەحموودی بە حەسرەتەوە یادی سەردەمی روودەکی دەکەنەوە... بە هەمان شێوە دەبینین فروغ خۆزگە بە سەردەمی منداڵیو نەوجەوانی دەخوازێتو ئارەزووی گەڕانەوە بۆ ئەو سەردەمانە لە شیعری فروغ دا زۆر دووبارە دەبێتەوە. لە زۆر شیعری خۆیدا یادی سەردەمی منداڵی کردووەتەوەو لە هەندیْ

شیعردا کۆمەڵێك یادگاریو بیرەوەری ئەو رۆژگارانە دەگێڕێتەوە. لە شیعری (دوای تۆ) بە گوتاری (ئەی حەوت ساڵی) یادی سەردەمی منداڵی دەکاتەوەو لە شیعری (کەسێك کە وەکو هیچکەسێك نیە)دا بە زمانی کچێکی منداڵەوە قسە دەکات.

تەنیاییو غوربەت، تیمەیەکی دیکەی شیعری فروغە، لە ژیاندا تەنیایە. هەندێجار لە ئاخرو ئۆخری شەودا شیعر دەڵێت. لە شیعری ئەودا باسی ماڵانی چۆڵو تەنیایی عەسرانی هەینی دەکرێت. لە نامەیەکیا بۆ براکەی دەنووسێت: "ژیان وایە یان دەبێ خۆت بە شادمانیو بەختەوەری رۆتینی و ئاسایی وەکو منداڵ و مێردو خانەوادە فریو بدەیت یان بە شادمانیو بەختەوەری نائاسایی وەکو شیعرو سینەماو هونەرو ئەم شتە بێهودانە! بەڵام بە هەرحاڵ هەمیشە هەر تەنیایتو تەنیایی دەتخواتو وردوخاشت دەکات". (بڕوانە: مجله فردوسی، ٢٧/ مرداد/ ١٣٤٨).

سادەییو خۆشباوەڕیو متمانەی نابەجێ: یەکێکە لە تیمەکانی دیکەی شیعری فروغو زیاتر ئاماژەیە بۆ خۆشباوەڕی و متمانەی نابەجێی خۆی لە زەمانی گەنجیو لە کاتی شووکردنا. هەروەها مەسەلەی زەوجینو رامان لە رێو رەسمی زەماوەندو باسکردنی لایەنە جۆراو جۆرەکانی جلی بوکێنی یان سفرەی ماڕەبڕین کە هەر هەمووی نیشانەو رەمزی بەختەوەری درۆینەن.

((٦))

(لە دایکبوونێکی تر) ناوی دوا شیعری کۆمەڵە شیعری ( لە دایکبوونێکی ترەو شاعیر کردوویەتی بە ناونیشان دیوانەکەی خۆی. فروغ بەم دیوانە هاتە ریزی گەورە شاعیرانی رۆژگاری ئەمڕۆوەو بە تەواوەتی لە فەزای شیعریی کۆمەڵە شیعرەکانی تری هاتە دەرێ. هەر چەند شیعرەکانی هەوەڵی ئەم دیوانەش لاوازن، بەڵام بە گشتی، کۆمەڵێك شیعری زندوو و جوانی لە خۆ گرتووە.

بە نێوبانگترین شیعری ئەم دیوانە، شیعری (لە دایکبوونێکی ترە). ئەم ناونیشانە هێماو ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە فروغ لە رووی شیعرییەوە، سەر لە نوێ لە دایك بووەتەوە. فروغ لەم شیعرەدا، خۆی بە پەرییەك شوبهاندووە، کەلە ئۆقیانووسێکدا، کونجی تەنیایی گرتووە (پەری نابینرێ). ئەم تیمەیە شرۆڤە دەکات کە لەگینە مرۆڤێك بۆ هەمیشە لە رابردوودا بمێنێتەوەو ئەمە بە مانای مەرگو فەنایە. لێ ئەگەر کەمێك بتوانێ لە سەفەری ڕابردووەکان بگەڕێتەوە، بە زندوویەتی دەمێنێتەوە، وەکو چۆن شاعیر بە خۆی لە سەفەری ترسناکی بیرەوەرییەکان، سەرەنجام بۆ زەمانی ئێستا دەگەڕێتەوە. فروغ پێی وایە کە رابردوو لە گۆلاێك دەچێت کە نابێ لەو گۆلاوەدا بە دووی مرواریدا بگەڕێیو، بە ئومێدی مرواری بیت، ئەگەر وانەبوایە ئەویش لەوێدا، لە دیار گۆلاوەکە دەمایەوە. وێڕای ئەمەش لە شیعرەکانی دیکەی فروغ دا ئەوەش دەبینین کە ژیانی ئێستاشی ئەوە نیە کە بە تەمای بووە.

(لە دایکبوونێکی تر) سێبەرو کاریگەرییەکی فرەی بەسەر شیعری مۆدێرنی ئێرانەوە هەبووە،و سوهرابی سپەهری لە رووی شێوازەوە نزیکترین شاعیرە لە فروغەوە...

یەکێك لە نیشانە دیارەکانی شیعری نوێی فارسی بایەخدانی راستەوخۆو هۆشیارانەیە بە پرسە کۆمەڵایەتی و جڤاکیەکان... لە ئەدەبیانی کۆنیش دا، بایەخدانو گرینگی دان بە رەوش و وەزعو حاڵێن کۆمەڵایەتی و رامیاری دەبینرێ، بەڵام هەرگیز بەم ڕاستەوخۆیی و فراوانییەی ئەدەبیاتی نوێ نیە.

فروغ، سەبارەت بە پرسە جڤاکیەکانی سەردەمی خۆی دیدو بۆچوونێکی هەستیارو ڕەخنەیی هەیە. یەکێك لە شەڕەکانی ئەو، دەگەڵ ئەو یاساو عورفو دابو نەریتانەدایە کە بە شێوەیەکی گشتی بە زەرەری ژنانن. فروغ وەکو ژنێکی یاخی و سەرکێشو لە هەمان کاتدا رۆشنبیر، ئامادە نیە مل بۆ ژیانی ئاسایی و مەزلوومانەی ژنی ئێرانی بدات، بۆیە بەگژ یاساو دابو نەریتی چەوساندنەوەی ژناندا دەچێتو ئەمە یەکێکە لە پاشخانو زەمینەی سەرەکی شیعری ئەو. لە نامەیەکیا کە لە ١٢/دەی/ ١٣٣٤دا لە ئەهوازەوە بۆ گوڤارێکی ناردووە، دەڵێت: "ئاواتی من ئازادی ژنانی ئێرانو یەکسانی ماڤ وانە دەگەڵ پیاواندا. من بە تەواوەتی ئاگام لە دەردو رەنجی ئەو خوشکانەمە کە لەم وڵاتەدا بە هۆی بێدادی پیاوانەوە دەیکێشنو نیوەی هونەرەکەم بۆ بەرجەستەکردنی ژانو ئازاری ئەوان تەرخان دەکەم." (بڕوانە: مجلە خوشە، نوروز ١٣٤٦). فروغ، لە هەندێ شیعریا، بە ڕاشکاویو بێ پەردە باسی ماشوقی پیاوی کردووە،!... لە شیعری جوانی (فەتحی باخ)دا دەڵێت کە ئەشقو خۆشەویستی لەوەدا نییە کە دوو ناو لە تۆماری رزیوی مەحزەرو نووسینگەی مارەو تەڵاقاندا، لە تەنیشت یەکەوە تۆمار بکرێن، بە گوتەیەکی دی مەرج نییە مارەنامە زامنی بەردەوامی و پاراستنی ڤیانو خۆشەویستی بێت.

فروغ سەبارەت بە قانونو فریشتەی عەدالەت زۆر رەشبین بوو. چونکە یاساکان هەمیشە دژی ئەو و هاورەگەزانی ئەو بوو. خەباتی ئەو بێفایدە بوو، ئیدی بۆ خۆ پاراستن لەو هەموو زوڵمو نەهەقیە پەنای بۆ "ڤیان و ئەشق" دەبرد، گوشاری دنیای دەرەوە، ناچاری دەکرد پاشەکشە بۆ جیهانی ناوەوەو دەروون بکات. ئەوەتا لە بیرەوەرییەکانی سەفەری ئەورووپایدا دەنووسێت: "گوشاری ژیان، گوشاری ژینگەو گوشاری ئەو کۆتو زنجیرانەی کە لە دەستو پێی بەستبوومو من بە هەموو هێزو توانای خۆمەوە هەوڵم دەدا ڕوو بە ڕووی ببمەوە، شەکەتو ماندووی کردبووم. من دەمویست "ژنێك" واتە "بەشەرێك" بم. دەمویست بڵێم کە هەقی ژیانو ماڤ هاوار کردنم هەیە، ئەوانی دی دەیانویست هاوارەکانم بەسەر لێوانمەوە بتاسێننو هەناسەم لە سینەمدا خەفە بکەن." (بڕوانە: مجلە فردوسی/ سال نهم/ ١٣٣٦).

فروغ، هاتوچۆی کۆڕو کۆبوونەوەو ئەنجوومەنە رۆشنبیرییەکانی تارانی دەکرد، بەڵام وەکو لە گفتوگۆو نامەو شیعرەکانیا بەدیار دەکەوێت، قەت بە هەندێ وەرنەگرتوون. بەحوکمی ئەوەی کە ژن بوو، لەوە دەچێت لە پیاوان باشتر، پەی بە پووچەڵی و بێناوەڕۆکی ئەم توێژە بردبێت. ئەو رۆشنبیرە سەتحیانەی کە لە ئاستی ئافرەتدا، دەبوون بە خاکی بەر پێیانو جەوهەری بۆشو بە تاڵی خۆیان دەنواند، ئەگەر رەخنەگر بوایەن، شاعیرێکی لاوازی ژنیان دەگەیاندە کەشکەڵانی فەلەك، ئەگەر مامۆستا بوایەن. چاوی تەماحیان دەبڕییە قوتابیەکانی خۆیان. رۆشنبیرانێ کە لە

زەلکاوی مەی و مەینۆشیدا دەکەوتنە هەلەکەسەماو لەسەر مێزو خوانی شیودا، قسەی زلیان دەربارەی برسیەتی خەڵکی دەکرد.

دیارە فروغ، مەبەستی لەو رۆشنبیرو شاعیرو نووسەرانە بوو کە لە مەیدانی ئەودەبدا، ئیدیعای زانایی و دانایی و رۆشنبیرییان دەکردو خۆیان بەرەخنەگرو شاعیری نیشتمانی و نەتەوەیی و نووسەری نێو نەتەوەیی و تیۆریسینی گەورە دەزانی... لە نامەیەکیا بۆ ئەحمەد رەزا ئەحمەدی، دەڵێت:

"رەوشی ئەدەبیات جاران چۆن بوو، هەروایە، چەنەبازییەکی زۆر، بێهودە گۆییەکی زۆر ترو برێ کاری کەم... من کە دڵم تێك هەڵدێت، ئەوەندەی بتوانم هەوڵدەدەم خۆم لە پرتەوی ئەم پێوەرو ئامانجە گەوجانەو سواو و پواوانە دوور بگرم. من بیر لە دنیا دەکەمەوە، هەر چەندە ئومێدی دنیایی بوون زۆر کەمەو لە نرخی نەبوودایە، بەلام باشیەکەی ئەمەیە کە ئینسان لە سنووررداری ئەم ژینگە سێ بە چوارەو لەم حەوزی کرمانە رزگار دەکات، ئیدی نەك لەوە ناترسێت کە خراوەتە تاقیگەی بنکە هونەرییە بچووکەکانی ئەم وڵاتەوەو بۆ نەگبەتی دەرنەچووە، بەڵکو پێکەنینشی پێ دێت."

هەڵبەتە فروغ، دژی جیاوازی چینایەتیش بوو و بە دیاردەیەکی نا پەسندی دەزانی و بە چاوی رەزامەندی سەیری نەدەکرد. فروغ بە خۆی تالأوی هەژاری و نەبوونی چەشتبوو وهەندێجار تەنانەت خەرجی گیرفانیشی نەبوو. لە نامەیەکیا بۆ فەرەیدون فەرخزادی برای دەڵێت: "... ئێستا چلەی زستانەو من تا ئێستا سۆپام نییە. پارەشم نییە."، "... بە زۆری لە نیوەی مانگدا پارەم پێ نامێنێ و کەسێکم نییە کە کۆمەکم بکات."، "... من دە دانە ساڵە کە شیعر دەڵێم و هێشتاش وەختێ کە ئاتاج بە پەنجا تمەن دەبم، دەبێ سەری خۆم بگرم و لە بەدبەختیا بگریم."*

(بڕوانە: نامه مورخ ٣٠/دی/١٣٣٨ به فریدون فروخزاد، مجله فردوسی، ٢٧/مرداد/ ١٣٤٨).

دیارە هەڵوێستی ئینسانپەروەری و مرۆڤدۆستی و دلۆڤانی و میرەبانی فروغ هەر قسەی رووت نەبووە، بەڵکو بە کرداریش هەمان هەڵوێستی هەبووە. فروغ ژیانی گولان دەکات بە فیلم و منداڵێ یەکێك لەو گولانە، لەگەڵ خۆیدا دێنێ، بە فرزەندی هەڵیدەگرێتەوەو بە دڵ و گیان بە خێوی دەکات، منداڵەکە ناوی حوسێن دەبێت و بابی نوور محەمەد، کە لە خانەی گولانی مەشهەد دەبێت. لە نامەیەکیا بۆ نوور محەمەدی بابی حوسێن دەڵێت: "بە هەر حاڵ، دڵنیابە تا من لە ژیانا بم وەکو دایکێك سەرپەرشتی و چاودێری حوسێن دەکەم." لە نامەیەکی تردا دەڵێت: "بۆیە ئەمانەت بۆ دەنووسیم تا بزانیت کە من هیچ جیاوازییەك لە نێوان ئەو و کورەکەی خۆمدا ناکەم.".

فروغ، وەکو شاعیرێکی هوشیارو بە ئاگا، تەنیا نیگەرانی پرسە جڤاکی و رامیارییەکانی وڵاتی خۆی نیە، بەڵکو هەندێجار لە ئاستی جیهانیشدا نیگەرانی ئایندەی تیرەی بەشەرو ئەم پێشکەوتنە شارستانیە بی سنوورەیە. زانایان و ئیدیعاچیانی ئاشتی بە پێغەمبەرانێ دەشوبهێنێ کە پەیامەکەیان پەیامی وێرانی جیهان و فەنا بوونی تیرە بەشەرە:

پێغەمبەران، پەیامی وێرانیان

دەگەڵ خۆدا بۆ ئەم سەدەیەی ئێمە هێنا
ئەم تەقینەوە پەیا پەیانە
و هەورە ژاراویانە
ئایا دەنگدانەوەی ئایەتانی پیرۆزن؟
ئەی دۆست، ئەی برا، ئەی هاوخوێن
کاتی گەییشتیە سەر مانگ
مێژووی قەتڵ و عامی گوڵان بنووسە!
(شیعری پەنجەرە).

((٨))

مەیدانی شیعری ژنانی ئێرانی بە پێنج ناو ئاوەدانە: رابیعەی کچی کەعبی قزداری، مەهەستی گەنجەوی، عالەمتاج قائم مەقامی ناسراو بە ژالە، پەروینی ئیعتسامی، فروغی فەرۆخزاد. جا بۆ ئەوەی پایەی فروغ لەم مەیدانەدا دەربکەوێ، جێی خۆیەتی کە زۆر بە کورتیو لامسەرلایی دوو قسان لەمەر شیعروشاعیری هەر یەکێکیان بکرێت:

*–رابیعە: لە شاعیرانی سەدەی چوارەمە. کیژی کەعب بووە، کەعب ، لە گەورەپیاوانی عەرەب بووە. دەڵێن رابیعە ئاشقی بەکتاشی خولامی برایەکەی خۆی بووەو برایەکەی کوشتوویەتی... دەگێڕنەوە دەڵێن ئەشقی رابیعە ئەشقی مەجازی نەبووە، بەڵکو ئەشقی حەقیقی بووە. مخابن شیعری زۆر لە دوای رابیعە بە جێ نەماوە، ئەوەی ماویشە ناسکو خەمناکەو بەو شیعرانەدا ئەوە دەردەکەوێت کە دڵدارەکەی پیاوێکی روحزلو لە خۆبایی بووەو هیچ حیسابێکی بۆ ئەشقو ڤیانی شاعیر نەکردووە. رەنگە دڵدارەکەی لە دۆستانی براکەی بووبێ نەك نۆکەرو خولامی.

*– مەهەستی گەنجەوی: لە هاوعەسرانی سوڵتان سەنجەر بووە. دەڵێن جوانو دڵتەڕو ئەڤیندارو ئاشق پیشە بووەو عودیشی لێدەدا. یەکەم ژنە کە بە چوارینە سەرایی ناوی دەرکردووە. هەموو چوارینەکانی ئاشقانەن. لە هەندێ لەو چوارینانەوە وا بە دیار دەکەوێ کە مەهەستی ژنێکی بە جورئەتو گۆساخو بێباك بووە. ئەمەش نموونەیەکە لە چوارینەکانی:

روز ازل امدم نیشان غم تو
جان تا ابد بود مکان غم تو
من جانو دل خویش ازان دارم دوست
این داغ تو داردو ان نیشان غم تو

وەکو دەردەکەوێ شیعرەکانی (مەهەستی)ش وەکو رابیعە تەنیا بە دەوری سۆزو گودازوئەشقو ئاشقیدا دەسوڕێنەوە.

*– عالەمتاج قائم مقامی، ناسراو بە ژالە: لە ساڵی ١٢٦٢ هەتاوی لە دایك بووەو لە ساڵی ١٣٢٥ی هەتاوی لە تاران کۆچی دوایی کردووە. یەکێکە لە شاعیرە گەورە گومناوەکان. دایکی

پژمان بەختیاری شاعیری غەزەلخوانی هاوچەرخ و راستکەرەوەی دیوانی حافزە. هیچ کەسێك بە شاعیری ژالەی نەزانیوە. دوای مردنی، پژمان بەختیاری بە رێکەوت دەفتەری شیعرەکانی دۆزیوەتەوەو چاپی کردووە. رەنگە یەکێك لەو هۆیانەی کە حەزی نەکردووە خەڵکی بە شاعیری وی بزانن، ئەمەبێ کە لە شیعرەکانیا بە جورئەتەوە هێرشی کردووەتە سەر رەگەزی پیاو و گلەییەکی زۆری لە ژیانی ژن و مێردایەتی و مێردەکەی خۆی کردووە.

عالەمتاج لە تەمەنی شازدە ساڵیدا، لە پیاوێکی تەمەن چل و چەند ساڵەی سوپایی، تووڕەو تڕۆو زبر مارە کرا بوو. مێردەکەی بابایەکی میرپەنجی بوو (میرپەنجی: میرو فەرماندەی یەکەیەکی نزیکی پێنج هەزار کەسییە). کە جگە لە جەنگ و ڕاوو شکار هیچی تری نەدەزانی. ژالە، بە ناچاری ماڵی مێردەکەی چۆڵ کردو پەنای بردە بەر ماڵی باوکی، بەڵام لەو زەمانەدا دایك و باوکی مرد بوون.

مخابن شیعرێکی کەمی لە پاش بە جێماوە. دیوانەکەی تەنیا ٩١٧ بەیتە شیعری لە خۆ گرتووەو وا دیارە لە ئەدەبیاتی فارسیدا زەبەر دەست بووە. بە هەرحاڵ شاعیرێکی گەورەیە کە لە قاڵب و فۆرمی قەسیدەدا، شیعری زۆر تۆکمەو جوانی بە شێوازی شاعیرانی کۆن گوتووە. لێ ناوەڕۆکی شیعرەکانی تازەو مۆدی رۆژو ژنانەن و باسی شانەو ئاوێنەو مەکینەی خەیاتی و سەماوەرو سفرەی مارەبڕین و منداڵ و رەوشی بێوەژنان و مەزڵومیەتی ژنی ئێرانی دەکات و لە هەموو ئەمانەش گرینگتر زۆر بەتوندی ئیراد لە رەگەزی پیاوو بە تایبەتی لە مێردەکەی خۆی، دەگرێت.

*– پەروین ئیعتسامی: لە ساڵی ١٣٢٠دا واتە پێنج ساڵ پێش عالەمتاج، لە تەمەنی سی و چوار ساڵیدا کۆچی دوایی کردووەو لە قوم بە خاك سپێردراوە. هەڵبەتە عالەمتاجی نەناسیوە. پەروین لەو تەمەنە کورتەدا زۆر شاکاری ئەفراندووە. ژنێکی خوێنەوارو لە بنەماڵەیەکی زانست و ئەدەب پەروەر بوو. پەروین لە ساڵی ١٢٨٥ هەتاوی لە تەورێز لە دایك بووە. بابی پەروین، یوسفی اعتصامی، وەرگێڕی بێنەوایانی هۆگۆیە. پەروین عەرەبی لای باوکی و ئینگلیزی لە قوتابخانەی کچانەی ئەمریکاییەکان فێر بوو بوو. ئەویشیان دا بە پیاوێکی سوپایی (کە پسمامی خۆی بوو). ئەویش وەکو عالەمتاج، تەنیا ماوەیەکی کەم لە ماڵە مێردا هەڵیکردو بەرەو باوان بووەوە...

پەروین، لەوە مەزڵومترو شەرمنتر بوو کە تاقە وشەیەك لەمەڕ ئەڤینداری و هەستی خۆی یان شکست و ناکامی خۆی لە ژیانی ژن و مێردایەتیدا بڵێت. دەردو ئازاری ئەو لە بێدەنگی ئەودا پەنهان بوو. ئایا وەختێ کەسێك تاقە وشەیەك دەربارەی بابەتێك نەڵێت، نابێ ئەو بێدەنگیەی ئەو بە هاواری ئەو لێکبدرێتەوە؟... کەسێك شیری پاك بێ و بە وردی گوێ بگرێت، تێدەگات کە بێدەنگیش لە خودی خۆیدا قسە کردنە، هەموو گوێیەکی پاك لە زمانی بێدەنگی دەگات.

لە ئەدەبیاتی رۆژهەڵاتیدا، هەندێ مەسەلە هەن کە باسکردنیان قەدەغەیە، یەکێك لەو مەسەلانە عەشقی دنیایی و مەسەلەی بەدەنی و جەستەیی ئەشقە لە شیعری ژناندا،کە یەکێك لە کارە پڕ جورئەتەکانی فروغ، روخاندنی دیواری ئەم قەڵای بێدەنگیە بوو. لەم رووەوە شیعری هیچ شاعیرێکی ژن لە رووی راستگۆیی و هەستی واقیعیەت نوێنییەوە هاوتای شیعری فروغ نیە.

وەکو گوتمان پەروین لە شیعری خۆیدا هەرگیز خۆی لە قەرەی باسی پرسێن ئەشق و ئەشقێنی و ژن و مێردایەتی و کاروباری سێکسی و ئەمجۆرە شتانە نەداوە. لێ شیعرەکانی لە ئیرادو رەخنەی جڤاکی و سیاسی خاڵی نییە. بۆ نموونە بڕوانە شیعری (فرمێسکی هەتیو).

*- دوای پەروین، نۆرەی فروغە: فروغ لەلایەکەوە سەنتزی ئەم شاعیرانەی پێش خۆیەتی و لەلایەکی ترەوە تۆڵەی مەزلومیەتی هەموویان دەستێنێ! هەڵبەتە سەرکەوتنی فروغ تا رادەیەك لەمەدا بوو کە لە زەمانێکی ئازادترا هاتبووە دنیا.

هەموو ئەم شاعیرانە روحێکی ئازادو یاخیان هەبووە، ژیانی سنوورداری خانەوادەیی و ملهوڕی پیاویان پێ قووت نەچووەو زۆربەیان مرۆڤی مەزلوم و تەمەنیان کورت بووە.

رابیعەو مەهەستی لە چوارچێوەو جیهانی کۆنی شیعری فارسیدا بوێرانە ئەشقی خۆیان بەرانبەر بە پیاو دەربڕیوە. لە رۆژگاری دواتردا، رۆژ بە رۆژ قسەکردن لەو جۆرە پرس و مەسەلانە پتر قەدەغە بووە. ئەشق و ئاشقێنی دەبوایە ئاسمانی و بە رواڵەت رۆحانی بێت. عالەمتاج (ژالە) لە جیاتی ئەوە کەوتە ئیرادگرتن لە مێردەکەی خۆی و پەیوەندییە باوە کۆمەڵایەتیەکانی نێوان ژن و مێرد. پەروین، لەم مەیدانەدا بێدەنگی رەهای هەڵبژارد، بەڵام لە جیاتی ئەوە، بە رەخنەگرتن لە وەزع و حاڵی کۆمەڵایەتی باو، داخی دڵی خۆی هەڵڕشت.

فروغ، لە سەردەمێکا لە دایك بوو بوو کە ئازادی (هەر چەندە سەتحی بوو) بواری دەدا کە تۆڵەی چەند سەد ساڵەی مەزلومیەتی ژن بکاتەوە. فروغ زۆر بە گورجی ئەم دەرفەتەی قۆستەوە. هەم دەمی لە بابەتی ئاشقێنی قەدەغە کوتاو هەم کەوتە رەخنەو ئیرادگرتن لە یاساو داب و نەریتی باوی کۆمەڵایەتی و هەم هەستە رەسەنە ژنانەکانی بەرجەستە کرد..

هەڵبەتە فروغ لە دنیای هونەرو ئەدەبدا بلیمەت بوو. هەرچەندە وەکو شاعیرانی ژنی بەر لە خۆی خوێندنێکی رێك و پێکی ئەدەبی نەبوو، بەڵام لە دنیای وشەو ئاخاوتنی هونەریدا، داهێنەر بوو. مخابن، لە هەوەڵ و گەرمەی خەملینی مرۆڤانی خۆیدا، مەرگ بەرۆکی گرت و بە تامپۆنی ئۆتۆمبیل کۆچی دوایی کرد.

((٩))

فروغ، لە شیعرا زۆر گوێی بە قاڵب و فۆرمی شیعری نوێ و کۆن نەداوەو لەو رووەوە هیچ تاسووبێکی نەبووە. لە گفتوگۆیەکیدا بە بەرانبەرەکەی دەڵێت: "من زۆر سوپاسی تۆ دەکەم کە گوتت شیعری ئەمڕۆ و نەتگوت شیعری نوێ. چونکە شیعر نوێ و کۆنی نییە" (بڕوانە: مقدمە برگزیدە اشعار). دیارە لەمەدا هەق بەوە، چونکە زۆر جار دەتوانرێ نوێترین شیعر لە فۆرم و قاڵبێن کۆن و تەقلیدیدا بگوترێ، وەکو چۆن هەندێجار جەڵەبی ترین نێوەرۆك لە فۆرم و قاڵبێن تازەی ئازادو سپیدا، بە سواوترین زمان گوتراوە!... فروغ، شاعیرێك بوو کە بەرە بەرە زۆربەی شێوە شیعرییەکانی جەڕباندبوو و لەم رووەوە ئەو قسانەی کە دەربارەی ماهیەتی شیعر، زمانی شیعر، کێش و ئەم شتانە کردوونی هەمووی دروست و بەجێیە، بە تایبەتی کۆمەڵێك داوەری دروستی دەربارەی سوود وەرگرتن لە فۆرم و قاڵبی کۆن و بایەخی شیعرێن نوێ. فروغ، وەکو

زۆربـەی هاوعەسـرانی خـۆی، سـاویلکانە، یەکسـەری ئەفسـوونی شـیعری نـویٚ نـەبووە. لـە "چاوخشانێك بە شیعری ئەمڕۆدا" دەڵێت:

"من بە پێچەوانەی ژمارەیەك لە شاعیرانەوە، کە بە گەشبینییەکی ساویلکانەوە دەڕواننە بزوتنەوەی شیعری ئەمڕۆ... باوەڕم وایە کە ئەم شیعرە جگە لە یەك دووانیٚ... شیعرێکی بۆش و بەتاڵە... ڕوو بە ڕووی ئەم راستیە دەبیتەوە کە ژمارەی ئەو شاعیرو شیعرانەی کە دەتوانریٚ پشتیان پیٚ ببەستریٚ لە ژمارەی قامکانی دەست تێناپەڕیٚ." (بڕوانە: ارش، شماره ١٣/اسفند/ ١٣٤٥).

فروغ لە شوێنێکدا لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا: "بە ڕای تۆ دەکرێت لە فۆرم و قاڵبی کلاسیکی وەکو غەزەل و مەسنەویدا شیعری تەواو سەرکەوتوو بگوتریٚ؟ دەڵێت: "هەڵبەتە دەکرێت... شیعر قاڵب و فۆرم نیە، بەڵکو نێوەڕۆك و تیمەیە." (بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو). لە (مقدمه برگزیده اشعار)دا دەڵێت: "من زیاتر ناوەڕۆکم مەبەستە... هەندیٚ شیعر واهین، یانی جوانن. ئۆخژنت پێدەبەخشن، دەت لاوێنن. بە هەرحاڵ هەندیٚ شیعر "شاعرانە"ن. هەڵبەتە ئەمانە شیعرن. بەڵام شیعر لەم چوارچێوەیەدا ناوەستیٚ... هەر ئەمە نییە... شیعر شتێکە کە ڕەگەزی ناسکی و جوانی یەکێکە لە ڕەگەزەکانی. شیعر "بنیادەمێکە" کە لە ناو شیعردا دەژی، دیٚ و دەچێت، نەك تەنیا ناسکی و جوانی ئەو بنیادەمە... من وەختیٚ دەخوێنمەوە، هەندێجار حەزی لێدەکەم، پێم خۆشە، بەڵام پێم خۆشە یانی چی؟ ئەدی دوای ئەوە؟... لەم جۆرە کارانەدا زیاتر حاڵەت دروستکردن هەیە تا ئەفراندن. من پێموایە ئەوەی شیعری ئێمەی تێك داوە، ئەو بایەخە زۆرەیە کە بە ناسکی و جوانی دراوە. ژیانی ئێمە جیاوازە. زبرە. پەروەردە نەبووە. پێویستە ئەم حاڵەتانە بهێنرێنە ناو شیعرەوە. شیعری ئێمە ئەزقەزا پێویستی بە زبری و پەیڤ و وشەێن نا شاعیرانەی زۆر هەیە تا گیانی وەبەردا بێتەوەو سەر لە نویٚ زندوو ببێتەوە". (بڕوانە: مقدمه برگزیده اشعار).

((١٠))

فروغ، لە (مقدمە برگزیده اشعار)دا دەڵێت: "من هیچ کاتێك سەبارەت بە شیعر، بیرکردنەوەی خۆم لە قاڵب نادەم یانی بیرکردنەوەم دەربارەی شیعر سنووردار ناکەم. من دەڵێم شیعر لە هەموو شتێکدا هەیە. بەڵام دەبیٚ بیدۆزیتەوەو هەستی پیٚ بکەیت...

من شیعر، لە خوێندنەوەی کتێبانەوە فێر نەبووم و ئەگەر وا بوایە ئێستا قەسیدەم دەنووسی. هەروا خۆ بە خۆ وەرێکەوتم. وەکو منداڵێك کە لە لێرەوارێکدا گوم دەبیٚ. رووم کردە هەموو شوێنێك و لە هەموو شتێك ڕامام و وردبوومەوەو هەموو شتێك سەرنجی ڕاکێشام تا ئاقیبەت گەییمە سەرچاوەیەك و خۆم لەو سەرچاوەیەدا دۆزییەوە، خۆم کە بریتی بیٚ لە خۆم، هەموو ئەزموونەکانی لێرەوار."

لە کۆنی کۆنەوە تاکو رۆژگاری ئەمڕۆ زۆربەی فەیلەسووفان هەوڵیانداوە ماهیەتی ئەدەبیات شرۆڤە بکەن و بە شێوەیەك قسە دەربارەی گەوهەرو بونیادی ئەدەبیات بکەن. یەکەمین فەیلەسوف ناودار کە لەم بوارەدا باسێکی تێرو تەسەلی کردبێت ئەفلاتونەو ڕەنگە دوا فەیلەسوفیش سارتەر

بیٚ که له کتێبی (ئەدەبیات چیە؟)دا ماهیەتی شیعری خستووەتە بەر وردەبینی لێکۆڵینەوەوە.. بە هەرحاڵ بە بۆچوونی ئەفلاتوون چونکە جیهانی دەرەوەو بوون، بۆ خۆی وێنەو سێبەری دنیایەکی ڕەسەنی باڵاتری نادیاری نەبینراوە، بۆیە شیعری وەکو پرۆسەیەکی لاسایی کردنەوەی واقیع، بە کارێکی بێهودە ژماردووە. چونکە شیعر لاسایی کردنەوەی نووسخەی دووەمی جیهانێکە کە خۆی کۆپی جیهانێکی باڵاترە. شیعر لەم حاڵەتەدا کۆپی کردنەوەی کۆپییە، نەك کۆپی کردنی دەقە ئەسڵەکە کە جیهانە باڵاکەیە.

پاشان ئەرستۆ بڕێك دەسکاری تێورەکەی ئەفلاتونی مامۆستای کردو ڕایگەیاند کە کاری شاعیران لاسایی کردنەوەی ڕووت و موو بە مووی دنیای واقیع و بوون نییە، بەڵکو سۆزو گودازو هەست و حاڵەتە دەروونی و ڕوحی و زەینییەکانی خۆشیانی ئاوێتە دەکەن. یانی کاری ئەوان لاسایی کردنەوەیەکی موو بە مووی بیٚ ڕوح و گیان نیە. دیارە دیدو بوچوون و گۆشەنیگای هەر کەسێك بۆ دنیاو بۆ هەر شتێك جیاوازە، جا گۆشەنیگاو دەخالەتی هونەرمەند لە جیهان و لەو بابەت و شتەی کە لاسایی دەکاتەوە، بایەخێکی زیاتر لە لاسایی کردنەوەی ڕووت بە کارەکەی دەبەخشێت... بۆیە ئەگەر بابەتی لاسایی کردنەوەکە پێشینەی نەبێت، و تازە بێت بایەخی هونەری و لەزەتی ئەستاتیکی زیاتر دەبێت، چونکە لەلایەکەوە هەموو تازەیەك لەزەتی خۆی هەیەو لەلایەکی ترەوە هەوڵە بۆ دەوڵەمەندترکردنی ئەدەبیات. جا بەم پێودانگەو لەبەر ڕۆشنایی ئەو بۆچوونانەدا فروغ، بە هەموو حیسابێك شاعیرێکی ڕەسەن و داهێنەرە، یەکەم بە شێوەیەکی گشتی لاسایی بابەت و شتە ئەسڵەکانی کردووەتەوە. خۆی تەمەشای جیهانی دەرەوەو ناوەوەی کردووە، واتە دیدی خۆی بۆ جیهانی دەرەوەو ناوەوە هەیە، نەهاتووە لە نیگاو دیدی ئەم و ئەوەوە، تەمەشای جیهانی ناوەوەو دەرەوە بکات. لەم و لەوی پرسیبێت کە چیان دیتووەو هەمان ئەو شتانە بڵێتەوەو کاوێژ بکاتەوەو بە عەینەکی تۆزو غوبارگرتووی مردووان و پێشینان تەمەشای دنیای کردبێت. . دووەم لاسایی هەندیٚ شتی کردووەتەوە، واتە هەندیٚ شتی دیتووە کە پێش ئەو شاعیرانی دی خۆیان لە قەرەی نەداوە. شاعیرانی دی هەر نەیان دیتووە، وەکو ئەوەی بەر لە فروغ ئەو بابەت و شتانە هەر نەبووبن... کەواتە فروغ هەم نوسخە ئەسڵەکەی کۆپی کردووە، کە ئەمە بۆ خۆی نیشانەی ڕەسەنایەتیەو هەم دیدو نۆڕینی بۆ جیهانی ناوەوەو دەرەوە تازە بووە.. دیارە فروغ لەم بوارەداو بە شێوەیەکی گشتی لە بواری شیعردا، بۆچوونی قووڵ و جوانی هەیە لەوانە: "...ئەگەر بتەویٚ شاعیر بی... لە نویٚ دەست بکە بە لە دایکبوون و خۆ بوون و هزرین و دۆزینەوەو کەشفکردنی مانایێن جیاواز، چەمکێن جیاواز. من ئەو کارە دەکەم، بەڵام زەحمەتە، زۆر زەحمەتە ، کۆڵنەدان و پایەداری و ئیستیعابی دەوێت." (بڕوانە: مجله فردوسی ٢٧/ مرداد/ ١٣٤٨، از نامەهای خصوصی او به فریدون فروخزاد). یان: "... تا دەتوانی تەمەشا بکە، بژی و ریتم و تۆنی ئەم ژیانە تێبگە.." (بڕوانە: از نامە بە احمد رضا احمدی). یان "... شیعری ئەمڕۆ، دیدو ئیدراکی تایبەتی زەمانی خۆی نییە. هەڵەی گەورەی شاعیرانی ئێمە لە مەدایە کە وا وێنا دەکەن بە ریز کردنی چەند ئاماژەو هێماو دەربڕینێکی تازەو کۆکردنەوەیان لە قاڵبێکی نا باوی نائاساییدا دەتوانن وێنەیەکی ئەم ژیانە توڕەو نەخۆشەی کە

له کوچه‌و کۆڵان‌و جاده‌و بانه‌کاندا به‌رده‌وامه، به ده‌سته‌وه بده‌ن، شیعری ئه‌مڕۆ ده‌ترسێت ناوی ئه‌و شت‌و شوێنانه بێنێ که له به‌یانیه‌وه تا ئێوارێ سه‌روکاری ده‌گه‌ڵیاندا هه‌یه." (بڕوانه: نگرشی بر شعر امروز، ارش، شماره ۱۳/اسفند/ ۱۳٤٥).

ڕه‌سه‌نایه‌تی شیعری فروغ له‌وه‌دایه که لاسایی هه‌رچیه‌کی کردبێته‌وه، چووه‌ته سه‌ر نووسخه ئه‌سڵه‌که‌و به‌ڕاده‌یه‌ك نه‌فه‌سی خۆی پێبه‌خشیوه که له نوسخه ئه‌سڵه‌که به‌رجه‌سته‌ترو کاریگه‌رتره، ئه‌مه‌ش پایه‌یه‌کی شیعری یه‌جگار گه‌وره‌ی پێبه‌خشیوه، ئه‌گه‌ر بمانه‌وێ پایه‌ی فروغ له نێو جوگرافیای شاعیرانی ژن دا دیاری بکه‌ین، بێگومان ده‌بێ له ریزی هه‌ره پێشه‌وه‌ی دا بنه‌ین. زۆربه‌ی شاعیرانی ژن، له چاوی پیاوه‌وه ته‌مه‌شای جیهانی ناوه‌وه‌و ده‌ره‌وه‌یان کردووه‌و هه‌مان زمانی ئه‌ویان به‌کار بردووه، به ڕاستی ئه‌ده‌بیاتی فارسی له مێژ بوو پێویستی به‌وه بوو که جیهانی ناوه‌وه‌و ده‌ره‌وه له دیدی ژنێکی وردبینه‌وه به‌رجه‌سته بکات‌و وێنه بگرێت‌و بخوێنێته‌وه. ئه‌ده‌بیاتی فارسی له‌و رووه‌وه بۆشاییه‌کی یه‌جگار گه‌وره‌ی تیا بوو و، فروغ هات‌و ئه‌م ئه‌رکه‌ی له ئه‌ستۆی خۆی گرت‌و له‌م رووه‌وه هه‌قێکی گه‌وره‌ی به‌سه‌ر ئه‌ده‌بی فارسییه‌وه هه‌یه.

((۱۱))

نزیکترین ده‌نگی شیعریی له فروغه‌وه، ده‌نگی سوهرابی سپه‌هرییه. سوهراب باشترین شیعری خۆی له ئاخرو ئۆخری ته‌مه‌نی فروغ‌و دوای فروغ نووسیوه، به‌مه‌دا ئه‌وه ده‌رده‌که‌وێ که له‌گینه سوهراب ئه‌و زمانه ره‌وان‌و تۆن‌و ئاهه‌نگه خۆرسکه له فروغه‌وه فێر بووبێ. ئه‌م دوو شاعیره رێزی تایبه‌تیان بۆ یه‌کدی هه‌بوو. سوهراب له شیعره‌کانی خۆیدا که‌م دابێژێك ئاماژه‌ی بۆ فروغ کردووه. له (ندای اغاز)دا ده‌ڵێت:

چیزهائی هم هست، لحظه هایی پراوج
(مثلا شاعره‌یی را دیدم
ان چنان محوی تماشای فضا بوو که در چشمانش
اسمان تخم گزا شت...).

***

هه‌ندێ شتیش هه‌ن، هه‌ندێ ساتێن پڕ لوتکه
( بۆ نموونه شاعیرێکی ژنم بینی
به جۆرێ مه‌حووی ته‌ماشای فه‌زا بوو که له چاوانیا
ئاسمان هێلکه‌ی کرد....)

***

له گینه ئه‌مه ئاماژه بێت بۆ ئه‌م دێڕانه‌ی (تولدی دیگر):

و پرستوها در گودی انگشتان جوهریم
تخم خواهند گزاشت.

*

پەرەسێلکان لە چاڵایی قامکانی مەرەکەباویم دا
هێلکە دەکەن.

هەروەها سوهراب لە شیعرێکی سەربەخۆدا بە ناونیشانی (دوست) سۆزو گودازو هەستو نەستی خۆی دەربارەی فورغ، شیعریانە دەربڕیوە:

گەورە بوو
و خەڵکی ئەمڕۆ بوو.
وخزمی هەموو ئاسۆ کراوەکان بوو
و چەند باش دەنگو ئاوازی
ئاوو زەوی تێدەگەیی.

***

فروغیش پەی بە بلیمەتی سوهراب بردبوو. ئەوەتا دەربارەی سوهراب دەڵێت: "سوهراب لە بەشی کۆتایی کتێبی "اوار افتاب – دارو پەردووی خۆر"ەوە دەست پێدەکاتو بە شێوەیەکی زۆر تازەو ئەفسوناویشەوە دەست پێدەکاتو بەردەوامەو دەچێتە پێشێ. سپەهری لە هەموو ئەوانی دی جیایە. دنیای فیکریو هەستی ئەو بەلای منەوە جوانترین دنیایە. سوهراب باسی شارو زەمانو خەڵکانێکی تایبەتی ناکات. باسی مرۆڤو ژیان دەکاتو هەر لەبەر ئەمەشە بەرینە. لە مەیدانی وەزندا ڕێگای خۆی دۆزیوەتەوە. ئەگەر هەموو تواناکانی خۆی هەر بۆ شیعر تەرخان بکردایە، هەنگێ دەتبینی کە دەگەییە کوێ." (بڕوانە: ارش، شماره ١٣/ اسفند/ ١٣٤٥، گفتوگوی سیروس طاهباز و دکتر ساعدی با فروغ ).

مخابن فروغ لە مانگی بەهمەنی ساڵی ١٣٤٥دا کۆچی دوایی کرد وبەردەوامی هەڵکشانی شیعریی سپەهری نەبینی.

فروغ، لە شوینێکا ئەم شیعرانەی سپەهری دەگەڵ شیعرێن خۆیدا بە دەنگ خوێندووەتەوە: (روناکی، من، گوڵ، ئاو).شێوازی شیعری ئەم دوو شاعیرە هێندە لێکدیەوە نزیکن کە بە ئاسانی لێکدی جیاناکرێنەوە. زمانیان سادەو روونو رەوانە، دیدو نۆڕینو جیهانبینیان تازەو خۆڕسکە. زۆر وشەی هاوبەشی وەکو: (سێو، ئاوێنە، پەنجەرە، ئەشق، تەنیایی، جۆگا، شەقام، ژیان، هەڤئامێزی، حەجم، سەوز، دەم، سات...) لە شیعری هەردووکیاندا دووبارە بووەتەوە، خۆ لە هونەرە ئەدەبییە گوزارەکاریو جوانکارییەکانیشدا زۆر جار دەشوبهێنە سەر یەکتری.

هەڵبەتە لە ئۆتموسفیری مەعنەویاندا هەندێ جیاوازیان هەیە. سپەهری شاعیرێکە خودانی جیهانبینیو سیستەمێکی هزری دیاریکراوی ئەوتۆیە کە دەکرێ بڵێین تا رادەیەك شەقڵو مۆرکێکی فەلسەفی یان بە گوتەیەکی دی عیرفانی هەیە، سپەهری بەشێوەیەکی گشتی شاعیرێکی رۆشنبیرە کە شیعرەکانی پڕن لە هێماو ئاماژەێن رۆشنبیری. فروغ زیاتر عاتیفیو هەستیارەو لە شیعری ئەودا هیچ هێماو ئاماژەیەکی رۆشنبیری و فەرهەنگی نییە. هەستیاری، هەندێجار فروغ بۆ مەیدانانی جڤاکیو تەنانەت سیاسیش دەکێشێت. فروغ زیاتر لەسەر ئەرزە، بەڵام سپەهری ئەگەر لەسەر ئەرزیش بێ، لەسەر ئەرزێکە کە هەموو کەسێك نایگاتێو پێی نازانێت. فروغ زیاتر

له زەمانی رابردووا و دەگەڵ بیرەوەریاندا دەژی. سپەهری له زەمانی حاڵو ئێستادایه. له ڕابردوو و ئاینده دابڕاوه. ئەمه له حاڵێکایه که فروغ بۆ تاقه ساتێکیش له بیری (قاقەزقوشیان) غافڵ نییه. سپەهری ئەگەر هەندێجار یادێکی منداڵی و منداڵ بکات لەو روانگەیەوەیه که منداڵ رەمزی پاکی و بێگەردییەو کەسێکه هێشتا نیگای به گەردو غوباری داب و نەریتان لێڵ نەبووه. به هەر حاڵ ئەویش وەکو فروغ به بیانووی جیاواز جیاوازەوه دەچێته سۆراخی منداڵان و منداڵی.

فروغ، شکست خواردوو و رەشبین و نا ئومێده، ژنێکی تەنیایه، هەمیشه له ئاستانەی وەرزێکی ساردا بووه، بەڵام سپەهری گەشبین و چالاك و زیتەڵ و شادو شەنگوڵه، پیاوێکی تەنیا بەڵام ئاوەدان و قەرەباڵغ که هەمیشه له ئاستانەی بەهارێکی سەیردا بووه. ئەگەر ژیان بۆ فروغ جگه له هەوری رەشی بێ تاقەتی هیچی تر نەبووبێ، ئەوا بۆ سپەهری رەمزی خۆشی بووه.. بەڵام سەبارەت به زۆر بابەت و وردەکاریش، دیدو گۆشەنیگای هاوشێوەیان هەیه. هەردووکیان جیهانبینی وردیان بۆ تەبیعەت هەیه. ڕاسته که یاساو ڕێسا کۆمەڵایەتی و کێشەکانی ژیان، ژنێکی تەنیای وەکو فروغ، بەرەو ئەوه دەکێشێت نا ئومێدانه، رەشبینانه گوزارشت له ژیان بکات، بەڵام سپەهری سۆڤ ئاسا، گوێ به یاساو ڕێسایان نادات و دەم له چالاکی و چەلەنگی دەکوتێ، بەڵام هەندێجار جۆری بەرخوردەکەیان له بونیاددا دەشوبهێته سەر یەك. بۆ نموونه لەو پێناسانەدا که هەردووکیان دەربارەی ژیان کردوویانه، ژیان به ئاوێتەیەك له مردن و ژیان، خەم و شادی، خراپی و باشی دەزانن، لێ فروغ کاردانەوەی هەیه، بەڵام سپەهری دەڵێت ئەمه یاسای ژیانەو دەبێ به رووی خۆشەوه حەقیقەت قەبووڵ بکەی.

وەکو گوتمان سوهراب شاعیری بەهارو فروغ شاعیری زستان بوو، هەڵبەته له بندێری شیعری هەر یەکێکیاندا، جۆرێك له پێشبینی مەرگی خۆیان بەدی دەکرێت، یان وەکو دەڵێن هەستی شەشەمیان یان دڵیان خەبەری داوه، ئەوه بوو سوهراب له بەهاری ساڵی ١٣٥٩= ١٩٨٠ به نەخۆشی شێرپەنجه کۆچی دوایی کردو فروغی شاعیری زستان، هەم له زستاندا له دایك بوو،و هەم له زستانی ١٣٤٥= ١٩٦٦دا کۆچی دوایی کردو له (باوەڕ بێنین به سەرەتای وەرزی ساردا) که مێژووی زستانی تەمەنی ئەوه، دەڵێت:

ئەمڕۆ رۆژی یەکەمی دەی مانگه.
من رازی وەرزەکان دەزانم
و زمانی ساتەکان تێدەگەم
فریارەس له گۆڕا نوستووه
وخاك، خاکی پەزێرا
ئاماژەیەکه بۆ ئارامی
به دایکم گوت: ئیدی تەواو بوو.
گوتم: هەمیشه پێش ئەوەی تەسەور بکەی روو دەدا
پێویسته، بۆ رۆژنامه، پرسەنامەیەك بنێرین.

